کوردستان لە سەفەرنامەی بیانیدا - زنجیرەی ژمارە ٧

# لورستان

## لە سەفەرنامەی گەشتیاراندا

محەمەد حوسێن

وەرگێڕانی
سەڵاح نیساری



محەمەد حوسێن

# لورستان لە سەفەرنامەی گەشتیاراندا

وەرگێڕانی سەلاح نیساری




هەولێر - ٢٠١٣






**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە** **کۆمەڵەی ئینسکلۆپیدیای کوردستان**

- **کوردستان لە سەفەرنامەی بیانیدا ـ (٧)**
- **لورستان لە سەفەرنامەی گەشتیاراندا**

---

- محەمەد حوسێن

---

- وەرگێڕانی: سەلاح نیساری

---

- نەخشەسازی ناوەوە: **ڕێدار جەعفەر**

---

- بەرگ: هۆگر سدیق

---

- نرخ: (٣٠٠٠) دینار

---

- چاپی یەکەم: ٢٠١٣

---

- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

---

- چاپخانە: موکریانی (هەولێر)

---

- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٢٧٨٧) ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٧٤٣)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێرست

## بەرکولٚ

خوێنەری ئازیز، ئەو کۆرپەیەی ئێستە لەبەر دەستی ئێوەی بەڕێزدایە، پوختەی سەفەرنامەی **٣٣** گەڕۆکی فرەزان و رووناکبیر و شارەزا بە ژیان و ژیاری گەلانن، کاتی خۆی بە زمانەکانی فارسی، ئینگلیزی و ئەڵمانی نووسراوە. هەر یەکە و بەشێواز و مەبەست و ویستی خۆی بە لوڕستاندا گەڕاون، لەمەڕ ژیان و زمان و ڕەچەڵەك و دەسەڵات و گوزەرانی ئەو خەڵکەوە چییان دیتووە و ژنەفتووە و هەست و نەستی خەڵکی ئەم دەڤەرەیان دەجانتای خۆ ئاخنیوە و" لە کتێباندا بە چاپیان گەیاندووە و پێشکێش بە خوێنەرانی وڵاتی خۆیان کردووە. ئەوا ئێستەش منی کورد سۆرانیی دانیشتووی موکریان ئەم سەفەرنامە و سەیراننامانە دەهێنمەوە سەر زمانی کوردی و کەلەبەرێك لە کتێبخانەی کوردیی پێ پڕ دەکەمەوە، بەو هیوایە توانیبێتم دەلاقەیەکم بەڕووی ئەو ناوچەیەدا کردبێتەوە.

لە سەیراننامە و سەیاحەتنامەی دەورەی قاجارەکاندا، لوڕستان بەم دوو ناونیشانە ناسراو بوو، "پیشکوە"، "پشتکوە"، بەرچیا و پشت چیا. یان پشتکۆ و پێشکۆ. گەڕیدەکاتنیش لەکاتی سەردانەکەیاندا هیچ وەختێ لەبارەی ناوچەیی و نەتەوایەتی، جیاوازییان لە نێوان ئەو دووانەدا نەدیوە و تۆفیریان دانەناوە. لەو کتێبەشدا ئەوانەی باس دەکرێت لە بازنەی نووسراوەی گەڕۆکان لای نەداە و" چییان لە نێزیکەوە دیتووە لە ماوەی ئەم دوو سەد ساڵەی ڕابردوودا لەبارەی لوڕستان، تۆماریان کردووە.

نابیٚ ئەوەشمان لەبیر بچیٚت کە ئیدارەی فەرهەنگ و ئیرشادی لوڕستان بە چاپ و بڵاوکردنەوەی "پەڕتووکناسی و شارەزا بوون بە ناوچەی لوڕستان" بە پیٚنووسی سەید فەرید قاسمی لە دەڤەرەکەدا. کە دیارە کۆی ئەم بەرهەمە پوختە نووسراوەی ئەو کەسانەیە، کاتی خۆی سەردانی لوڕستانیان کردووە و بە وردی ناوچەکەیان بەسەر کردۆتەوە.

بەڕیٚز مورتەزای ڕەهبانی ئەوبەشانەی لە سەفەرنامەی گەڕۆکی ئەڵمانی بەڕیٚز هیٚر تسلفد دا لەسەر لوڕستان نووسراون وەریگیٚڕاونەتە سەر زمانی فارسی و حەسەن ئاریا، پیٚداچوونەوەی لەسەر کردووە، ماڵیان ئاوا و قەڵەمیان بەپیٚز بیٚت.

## سەرەتایەك

هەموومان دەزانین سەدەی ناوەڕاست لە سەرەتای چەرخی شازدەی زایینییەوە بەرەو نەمان چوون، ئەوسا ئەورووپییەکان پێیان نایە سەر خولێکی نوێتر، کە دیارە ئەمەش بە سەرهەڵدانی دەورەی ڕێنیسانس تیشکی بەر دەکەوێت. سەرهەڵدان و ڕسکانی ئەدەبیات و زانست و هونەر دەستی پێکرد و هەناوی مرۆڤایەتی گیانێکی تازەی وەبەر هات و کەشوهەوای لەبار بۆ هزرڤان و ئاوەزبەپێزان ڕەخسا، تاکو هەوڵی بووژاندنەی ژیار بدەن و ئاوەدانی بە وڵات ببەخشن.

واتە لە دەسپێکدا کشتوکاڵ ببووژێننەوە، دواتر پیشەسازی و زانست و بیری سەردەم بخەنە گەڕ و، پەنجەرەیەکی هەراوتر بە ڕووی جیهانی نوێدا بکەنەوە. هەر لەو چاخ و خولەدا هەرەسهێنانی دەسەڵاتی کلێسا و گەشەکردنی هزری تیژی ڕزگاریخوازی، بووە ڕچەشکێن لەبەر دەم فەرهەنگی ئابووریدا. هەر لەو هەلومەرجەدا جڤاتی زۆری وڵاتانی ئەورووپایی لەژێر سەیوانی ئیمپراتۆری پیرۆزی ڕۆم، زۆتر بە پێشەوایی ماڵباتی پادشایی ئاڵمان، تا ڕادەیەکی بەرچاو دەرگەی سازگاری و ژیار و وێژەوانیان بە ڕووی دنیادا کردەوە و تیشکی قەتیسماوی ژین و ژیانیان بە ئەورووپادا بڵاو کردەوە. سەرمایەی بەهێز و پێزی مادی و مەعنەویی ئەوان لە شەڕگەکانی ناوخۆدا بە زایە نەچووبوو، زۆرتری ئەوانە تەرخان کران بۆ بووژانەوەی هونەر و زانست و خێر و خۆشیی ژیان ویستان.

لێکترازان و نەمانی ئیمپراتۆری ڕۆمای ڕۆژهەڵات یان بیزانس، لە چەرخی پازدە دا، هەروەها توانەوەی دەسەڵاتی ئیسلامیی ئەندەلیووس لە دوایین تەمەنی ئەو سەدەیەدا، بووە هۆی ئەوەی زانا و ڕووناکبیر و ئاوەزبەرزانی فرەزانا، لە قوستەنتینەوە بچنە وڵاتانی دیکەی ئەورووپایی و بەتایبەت ئیتاڵیا. لەوێ لە دەوری یەکدی کۆزیلکە ببەستن و لەبەشێکی دیکەوە خۆرئاوای ئەورووپا بەوپەڕی زانستی ئیسلامی لە ئەندەلووس

هاوبەش بکەن و هەوێنی فەرهەنگی یونانی و قەتیس لە ئەندەلووس تێکەڵی ڕۆشنگەریی مەسیحیان بکەن.

گەشەکردنی پیشەسازیی تایبەت بە مەکینەی هەڵم و دۆزینەوەی بەژی ئەمەریکا و داهاتی سامانی زۆر لە ڕێگەی بازرگانیکردنەوە و دژایەتیی زانا و ڕووناکبیرانی خۆرئاوای بە دەستێوەردانی حکوومەت لە کاروباری بازرگانیدا لە لایەك و دەستگرتن بەسەر وڵاتانی ئەفریقایی و ئاسیایی و ئەمەریکای لاتیندا و شۆڕبوونەوەی دەسەڵات بۆ سەر وڵاتانی خۆرئاوای لە لایەکی دیکەوە، دەستیان دایە دەستی یەکدی و ڕۆژگارێکی تێر و تەسەلیان بۆ خەڵکی ئەورووپا مسۆگەر کرد. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی چاوەچڵەیان بەر فرەوانتر بێت و بۆ دوور و نێزیك پەل بهاوێن.

ئەو دەستەیە لە ئەورووپاییان کە بەرەو ئاسۆ خزین و ڕوویان لە ڕۆژهەڵات کرد، بە تایبەت ئێران، بەسەر چەند دەستە و تاقمدا هاوێر دەکرێن: یەکەم، بازرگانان کە بەمەبەستی بەدەستهێنانی بازاڕ و ئاڵوویر لە بواری بازرگانیدا، ڕوویان لە ناوچەکە کرد. دووەم: ئەو وەفدە سیاسییەی سەرەتا لەژێر دەمامکی کاری بازرگانیدا، دواتر بە مەبەستی ئەرکی سەربازی هاتن، کە دیارە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ دەورەی سەفەوییەکان، کەپێی دەڵێن دەورانی مەسڵەت و ئاشتەوایی لە ئێراندا. سێیەم: ئەو فەرمانبەرانەی کە زۆرینەیان لە کەپەنکی شوانان‌دا، بەڵام بە دێوجامەی تایبەتەوە، دەهاتن بۆ بەدەستهێنان و کۆکردنەوەی زانیاری لە بواری رامیاری و جۆگرافی و نەتەوەییدا. ئەم ڕچەشکێنییەش لە کۆڵۆنیالیزمی هیندەوە بە دەستی بریتانیا سەری گرت و تەوژمی پەیداکرد. چوارەم: ڕۆژهەڵاتناس و کەونارناسان، ئەوانە بە ڕوانگەی تاسە و حەزەوە لەسەر فەرهەنگی ڕۆژهەڵاتی و سەرچاوەی ژیاری مرۆڤایەتی، ڕوویان کردە وڵاتانی میسر و ئێران و چین و هیند. لە وڵاتی ئێمەدا بە تایبەت ڕێچکەی پاشماوەی بەنرخی دەوڵەتی هەخامەنەشی نوێنەری ژیاری شارستانییەتی ئێرانی و سریانییان گرتە بەر. تاکو بتوانن ڕەمز و ڕازی فەرهەنگەکانی ئێرانی کەونارا و بابل و ئاشوور و میزوپۆتامیا بەدەست بێنن، دەرگەی ئەم خەزێنە بە قیمەتە والا بکەن و ئەوەی لەلای ئەوان بەنرخە و تازەبووکە و لای خۆمانیش سووك و چرووکە، بیماشنەوە و لەگەڵ خۆیاندا بیبەنەوە و بزەیەکیش بەرووی ئێمەدا بدەن. پێنجەم: ئەو فەرهەنگدۆستانەی بە حەز و بێحەزەوە،

هاتوون له نێزیکەوه چێژ له فەرهەنگی ئێرانی و ئیسلامی و عیرفانی عارفانی وەك "حافز، عەتار، مەولەوی، شێخی شیراز سەعدی، شاعیرانی وەك خەیام و فێردەوسی" وەربگرن. تێکەڵ بە دنیای پڕ لە هەست و بەبیری ژیری ئەو شاعیرە مەزنانە بن و لەبەر سەیوانی باخەڕەزی خەیام پشوویەك بدەن و لاوێچێ له جۆباری مەی فڕ بکەن. هەروەك ئێستە چوارینەکانی خەیام لە وڵاتانی ئەورووپیدا لەپاڵ ئینجیل لەسەر تاقەی هەر ماڵێك سەرنجی خەیام ویستان بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت.

ئەو هەمکە گەڕۆکەی سەریان بە ئێران و ڕۆژهەڵاتدا کرد، زۆرینەی زۆریان سەربوردەی سەفەری خۆیان لە کۆپەڕاندا نووسییەوه و، سەرنجی تامەزرۆیانی زۆریەك لە خەڵکی ئەورووپایان بۆ بەهەشتی خەونەکانیانڕاکێشا. واتە دەستەی شەشەم. تۆوی حەز و تاسەی خۆرشیدی خاوەر و ئەفسانەی لەژێر تاپۆ و بوومەلێڵدا، چیرۆکەکانی هەزار و یەك شەو و سەربردەی ئەو خەڵکه بە چاوی خۆیان ببینن و لە نێزیکەوه کولۆکۆی تاسەیان دابمرکێنن. ئەمەش داهاتی ئێرانە لەو دەستەیە" ٣٢٥ ملیارد دۆلارله بواری گەڕۆکی جیهانیدا لە ساڵی ١٩٩٣ ، وڵاتی ئێران نێزیکەی ٤٠٠ یان بەوتەیەك ١٣٠ ملیۆن دۆلاری وەبەر کەوتووه. ئەوە لەحاڵێکدایه کە، ئێران دەیەمین وڵاتێکە کە گەشتیاران رووی تێدەکەن. بەو هەموو ئاووهەوا جیاوازەوه کە هەیەتی. وامبری، رۆژهەڵاتناس و گەشتیاری هەنگاری، وەختێ لە دەورەی قاجارەکاندا سەردانی ئێران دەکات، ئەم وڵاتەی وەك ڕەسەنترین خاوەن ژیاری ئەم جیهان پێناسە کردووه لە ڕۆژهەڵاتدا. سا وەختێ لەگەڵ ئیستانبول لەهەمبەر یەکدیدا ڕایان دەگرێت، بە بڕوای ئەو ئێران لە کەونارا و سەردەم پێك هاتووە، بەڵام لە سەفەرنامەی گەشتیارانی بیانیدا بەتایبەت سەدەی نۆزدە، دەبینین ئەوان بە چاوێکی دیکە لەمەیان ڕوانیوه و لەچاو گەلانی خۆیان بە دواکەوتووتر و چەقبەستوویان داناوین و پێیان وابووه خۆیان لەچاو ئێمە خاوەن ژیارترن. هەربۆیە داوایان کردووه ڕێچکەی ئەوان بگرینەبەر.

لەو گەشتیار و گەڕۆکانە زۆریان لایان داوەتە دەڤەری لوڕستان و بیرەوەریی خۆیان نووسیوەتەوه. لوڕستان لە دوای دەسەڵاتی شاهەباسی مەزن و لەبەر یەك بڵاوبوونی زنجیرەی "ئەتابەکانی لوڕ" بە دەستی ئەو پاشایە و سەرهەڵدانی دەسەڵاتدارانی بەردەوامی والیان تا کۆتایی یەکەم شەڕی جیهانی، وەك حکوومەتێکی سەر بەخۆ لەنێو

دەسەڵاتی ئێراندا دەهاتە ئەژمار. هەربۆیەش بێبڕانەوە دەسەڵاتدارانی لوڕ و حکوومەتی ناوەندی هەمیشە شەڕ و ناکۆکییان لەنێواندا هەبووە. سیاسەتی پاشاگەلی قاجاری بە تایبەت فەتەلیشا(فەتح عەلی شا)، بەردەوام خەریکی شەڕ و شۆر و ئاژاوەنانەوە بووە لە ناوچەکەدا بەتایبەت لەنێو هۆز و تایەفەکاندا. ئەم گزی و فزییەی بۆیە کردووە تاکو بتوانێ هەژموونی دەسەڵاتی بخاتە سەر هۆزی لوڕ لەو هەرێمەدا. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بۆ ماوەیەکی زۆر گەشتیار و سەیرانکەرانی بیانی نەتوانن سەردانی ئەم دەڤەرە نامۆیە بکەن. هەتا وای لێهات گەشتیاران قۆڵی هیمەتیان لێ هەڵماڵی و پووزەوانەیان دەپێ کرد و خۆیان لە دەسك نا و گوێیان نەدا بە پەنگر و پشکۆ، هاتنە لوڕستان و لەو سەیروسەفەرەدا دوو گەشتیار بوونە قوربانی.

چەند تایبەتمەندییەك بوونە هۆی ئەوەی ئەو گەڕۆکانە لوڕستان وەك شوێنێکی گەشتیاری هەڵبژێرن. بە تایبەت باری جوگرافیی ناوچەکە، تەنیا جادەی سەرەکی و هەوراز و نشێوی کەنداوی فارس بوو دەچووەوە سەر ناوچەکە. ڕێگەی شەمەندەفەر لە چیاکانی لوڕستان، لە ساڵەکانی دواییدا بووە هۆی بانگێشتنی گەشتیاران. لە دەورەی گەرمەی شەڕی گەلاندا جادەی قەدیمی بەغدا بۆ کرماشان داخرا. وردە وردە ئیشتیای سەردانی گەشیاران کرایەوە و هاوسابوونی بەشێکی زۆر لە خاکی لوڕستانی سەرەکی واتە پشتکۆ، لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی و پەلاماردانی کەوشەن و سەرحەدەکاتن، ئەمانە هەمووی بوونە هۆی ئەوەی ڕێگە بکرێتەوە بۆ هاتنە ژوورەوەی بیانییەکان بۆ ناوخۆی وڵات وەك گەشتیار و سەیرانچی. لە لایەکی دیکەشەوە هاوسێبوونی ناوچەی لوڕستان لەگەڵ دەشتی نەوتینی خوزستان و هەبوونی ڕەوند و خێڵاتیان، دەرگەی بە رووی هێزی سەربازیدا کردەوە بۆ ناوچەکە. هەروەك لەسەرەوە باس کرا، ئەوانە وەك ناوبژیوان و سنوورپارێز، بەڵام لە جلوبەرگی گەشتیاریدا وەك وەفدی ئەنجومەنی جوگرافیایی خونکاری لەندەن، دەستیان کرد بە گەڕان و پشکنینی دەڤەرەکە و بە ئارەزووی خۆیان گەیشتن. بە هۆی ئەوەی لوڕستانی بچووك یان لوڕستانی مەزن، یان وڵاتی بەختیاری لە دەورەی کۆندا، بەشێك بووە لە دەوڵەتی عیلام، وەك پێتەختی شووش ناسراوە. هەربۆیە زۆرینەی کەوناراناس و گەڕۆکانی لەزەبر بەوردبینییەکی ئەوتۆوە لەم بەشەیان ڕوانیوە. ئەوەی لە ساڵەکانی نێوان دوو شەڕی مەزنی جیهاندا بووە هۆکار تاکو کۆنینەناسان و

شارەزایان لە بواری مۆزە و ئەنتیکەناسیدا سەلیقەی خۆیان نیشان بدەن و لوڕستان وەك ناوەندی خەزێنەی بەرپێوار لە زەینی خۆیاندا دابگیرسێنن، لەپڕ دەرکەوتنی کەلوپەلی مەفرەقی لوڕستان لە گۆڕەکانی چاخی باستاندا بوو، هەربۆیە کەونینەناسان بۆیان دەرکەوت ئەوانە پاشماوەی سەدەی هەشتەمی بەرلە زایینن، دەگەڕێنەوە بۆ دەورەی ژیاری فەرهەنگی کاسییەکانی لوڕستان. لەم سالآنەی دواییدا، کۆمەڵناسانی ئەمەریکایی و فەرەنسی و دانمارکی خوێندنەوەیەکی باشیان بۆ خەڵکی ڕۆژئاوای ئێران و بە تایبەت لوڕستان کردووە و سەرنجیان داوەتە هۆز و ڕەوەندەکاتنی زاگرۆس و تۆژینەوەیەکی باش لەسەر زمانی "لەکی، لوڕی" کە ئەوانە پەلێکن لە زمانی پەهلەوی کۆن. بە سەرنجێکی زۆرەوە لەسەر فەرهەنگی ناوچەیی لوڕەکان کاریان کردووە.

ئێستەش باپێکەوە دەست بکەین بە موتالآکردنی سەفەرنامەی ئەو گەڕۆکانەی سەردانی لوڕستانیان کردووە.

## تێبینیی وەرگێڕ:

خوێنەری هێژا، وەك روونکردنەوەیەك ئەگەر لەچەند بڕگە و دێرێکشدا بێ، با خۆمان ئاورێك لە خۆمان بدەینەوە: ئەوەی راستی بێت ئەمە دەبێتە سێ کتێبی سەفەرنامە لە زمانی فارسییەوە دەیانهێنمە سەر زمانی زگماکی واتە کوردییە حەیاتەکەی خۆمان. من لێرەدا تاوان و ئۆبالْ ناخەمە ئەستۆی کەس و پەتی تۆڵە ئەستێنەوە بەملی کەسدا ناکەم حاکم و حەکیم و دەسەڵاتدار با ئێوەی خوێنەر بن چی دەکەن و چی دەڵێن کەیفی خۆتانە!

ئەگەر بەوردی موتاڵای سەفەرنامە و سەیراننامەکان بکەین، لەبەر و لە پشت لەسەدی یەکی من و تۆی کۆڵەواری بریندراری کۆیلەی ژێرچەپۆکەی بەشمەینەت نەمانئووسیوە و قەڵەممان پێدا نەهێناوە، سا ئەوانەی بۆ سەیروسەفەر و هەر مەبەستێك سەردانی ناوچەکانی خۆرئاوای ئێرانیان کرووە و بەخاکی لوڕستان و کوردستاندا گەڕاون، چیان نووسیوە نووسیویانە و بردوویانەتەوە بۆ وڵاتی خۆیان. کە دیارە مەبەستم گەشتیارانی بیانییە. ئەوە لەوان و ئەوانەی وەك نەتەوە جیاجیاکانی ئێرانی گەشت و سەیرانی خۆیان کردووە و بەکەیفی خۆیان باسی گەشتەکەیان کردووە، خۆ ئەگەر لە کۆنەوە تا ئێستە گەشتیاریانی کورد هەبووبێتن و شتێکیان نووسیبێت زۆر نین و ئەوەی بەنووکی خامەیاندا هاتۆتە سەر ڕووپەڕان بەزمانی دایکی نەبووە و ئەوەی بە فارسی و عارەبی نووسیویانە کەوتۆتە بەر شەن و باڵەکەوی نەیاران و هەرچییەك بە باوەڕی ئەوان بڤە بووبێت لێیان دەرهاویشتووە. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە دیسان ئەوەی خەڵکانی بیانی وەك سەفەرنامە و سەیاحەتنامە نووسیویانەتەوە، دواتر عارەب زمان و فارس زمانان وەریانگێڕاون سەر لەنوێ هەر بەم دەردە چوون کە باسمان کرد. ئەمە لایەنی هەڵقرچاندن و بەرگادڕین و شاردنەوەی کاکڵی مەبەست و ڕۆحی نووسراوەکە، بێجگە لەوەش ئەو کەسەی لە زمانی سەرەکییەوە کردوویەتی بە فارسی ئەوەی کە

بەراستی و روون و ئاشکرا بە قازانجی کورد بووە و نووسەر بەبێ مەراییکردن وەك خۆی هێناویەتی وەرگێڕ لای داوە و قرتاندوویەتی. کەچی ئەوەندە ویژدانیان نەجوولاوە وەختێ دەسەڵاتی ناوەندی کورد و لوڕی خستۆتە پەڕاوێزەوە و نانبڕاوی کردوون ناچارن پەنا بەرنە بەر ڕێگری و جەردەیی تاڵانکردنی چەوسێنەر و زاڵم و هەژارکوژان، هەروەك دەزانن ئەوەی زۆردار و بێعارە، زۆریشی بەدەستەوەیە.

ئەوەی لێرەدا خوێنەری ورد بین و بەویژدان دەتەزێنێ ئەوەیە، وەختێ باسی هەر جێیەکی ئەم ئێرانە پان و بەرینە دەکەن، چ گەڕۆکی بیانی، چ گەشتیاری خۆیی، ئەوەندەی باسی خاڵە شاز و بەپێز و جوانەکانی ناوچە فارسنشینەکان کراوە نیوەی نیوەی ئەمانەش باسی دزێوی و چەوتی و خاپینۆکی و بێشەرمیی ئەوان نایاتە ئاراوە، بەڵام خەڵکی لوڕستان و کوردستان، بە باوەڕی ئەوان دز و گۆران و چەتە و پیاوکوژ و دەستبڕ و تاڵانچین، کە دیارە هەر گەل و میللەتیکیش زمانی بخرێتە پەڕاوێزەوە و بۆی ببین و بۆی بنووسن و بۆی باخێون، هەرئاوا دەبێ و لەوەخاستر ناوی ناهێنن، مقەست و ڕدێنیش سا بەدەست ئەوانە.

لە کۆتاییدا ڕۆڵەی کوردی بیر وردی زمانپارێزی نیشتماندۆستم، نازانم تۆ چۆن ئەم تێبینییەم لێك ئەدەیەوە و بە چ پێوەرێك دەیپێوی، بەڵام ئەوە بزانە کە پێشینانی ئێمە لەبواری ڕۆشنبیریدا هەر هیچیان بۆ نەوەی دوای خۆیان نەکردبێ، توانیویانە بە نەخوێندەوارییەکەی خۆیان کولتوور و زمانەکەمان بپارێزن، ئەویش چ پاراستنێك، بەوپەڕی پاقژی و دوور لە هەڵە و پەڵە، دیارە کە هەر گەلێکیش زمانی دایکی خۆی نەپارێزێت لە هەڵدێری نەماندایە. لەپاڵ ئەوانەشدا، میللەتی کورد هەمیشە لە وڵاتی خۆیدا بەنامۆیی ژیاوە و هەرکەس وشەی ئازادیی بە زماندا هاتبێ زمانیان بڕیوە، کەچی ئاوەز قەتیسان هەستیان بەوە نەکردووە شۆفێری تەکسیەکان لەبن گوێی ئەواندا بە قەو هاوار دەکەن " ئازادی، ئازادی"

**سەلاح نیساری ١٤/ ١/ ٢٠١٣**

(١)

# گەشتیاران لە ڕابردوودا

یەکەم گەڕۆکێك کە سەردانی لوڕستانی کردووە، کەسێك بووە بەناوی ئەبودەلۆف گەشتیار و هزرڤانی خەڵکی باشووری شێوە دوڕگەی عەرەبستان و ڕەنگە دانیشتووی یەمەن بووبێت. ئەو پیاوە گەڕیدەیە ساڵی ٤١- ٣٣١ ك.م. هاتۆتە ئێران و نێزیکەی ١١٠٠ ساڵێك پێش ئێستە، بە بەشێکی ناوچەی لوڕستاندا گەڕاوە. بەختی خۆی زۆر بەخەستی باسی ئەوسەفەرەی خۆی واتە (سفرنامەی ابودلف)ی کرووە لە بەشی باشووری لوڕستان و ئەو نووسراوەیەش لە پەڕتووکخانەی ئاستانی مەشەد پارێزراوە. ئەبودەلۆف لە خزمەت نەسری کوڕی ئەحمەد سامانی یەکێ لە ماڵباتی ئێرانی و فەرمانڕەوای خۆراسان و سەرووی رووبارەکاندا بوو، بەتایبەت ساحەبی کوڕی عیباد، وەزیر و هزرڤانی ئێرانی و خەڵکی تاڵەقانی قەزوێن. تێکەڵ بە هاو کوفانی ئەو وەزیرە بووە و لەخەزانەی ئەو خواردوویەتی خۆی پۆشتە کردووە.

تەمەنی ئەبودەلۆف ٩٠ساڵ نووسراوە. بەپێی نووسراوەکانی خۆی بەشێکی زۆری ژیانی لە گەڕان و سەیر و سەفەردا بووە و هاتوچۆی چین و هیند و ئەرمەنستان و ئێرانی کردووە. بێجگە لەوەی سەبارەت بە جۆگرافیا و مێژوو نووسیویەتی زانیاری زۆری لەسەر کانەکانی وڵاتی ئێران هەبووە، لە بواری رووەکناسی و دەرمانسازیدا جانتای پڕبووە.

"زۆر وڵات و گوند و شاران گەڕاوم، لەگەڵ زۆر کەس دانیشتووم و کاتێك بەجێم هێشتوون، گەلێ کەس خەفەتیان بۆ خواردووم."

ئەلودەلۆف وەختیٚ سەردانی ئێران دەکات، لە خانەقین و بە جادەی کرماشاندا لە سەمیرەوە دێتە باشووری لوڕستان. لەوێدا بە کورتی باسێك لەسەر ماسبەزان یان ماسندان لە ناوچەی سەمیرە، دەنووسیٚ: شارێکی دڵگیر لە دەشتی مەیانکێودا هەیە و ئەو ناوچەیە پڕە لە گەڕاو و ئاوی کانزایی و گۆگرد و زاخ. دەڵیٚ ئەگەر کەسێك قومێك لەو ئاوانە بخواتەوە تووشی زگچوون دەبیٚ و دەچێتە ئاقاری مردنیٚ، سەمیرە شارێکە تێر تەماشای نابی و باخاتی زەیتوون و دارخورما و میوەجاتێکی زۆری هەیە و چیاکانی بە تارای بەفر داپۆشراوە.

هەروەك دەزانین شاری سەمیرە "دەڕەشار"ی ئێستەیە. بەبڕوای لوڕەکان ئەوشارە لەکۆندا خوسرەو پەروێز پاشای ساسانی وەك ئاران سازی کردووە و زستانان بۆحەسانەوە و ڕابواردن لەویٚ دانیشتووە. تاکو ئەم ساڵانەی ڕابردوو کەلاواکانی قەسری شیرین دیواریان بەسەر پێوە مابوو. لەسەر هەڵدێرێك کۆشك و تەلاری شاهانەی هەبووە و پێیان گوتووە ئەلوار. خەسرەو پەروێز شیرینی لەم قەڵایەدا دەپاراست بۆ ئەوەی دەستی فەرهادی نەگاتیٚ. گەشتیارانی سەدەی نۆزدەهەم بە تایبەت راولینسن، کە دواتر بە پوختی باسی دەکەین، لە نێزیکەوە چاوی بە کاولاش و وێرانەکانی شاری سەمیرە کەوتووە.



کیمپفەڕ، دەکریٚ بێژین ئەم گەشتیارە ئەڵمانییە دەچێتە ڕیزی ئەو کەسانەی بۆ یەکەمجار سەردانی ئێرانی کردووە. هەڵبەت مەودای نێوان سەفەری ئەبودەلۆف و کیمپفەڕ بۆ لوڕستان نێزیکەی ٧٥٠ ساڵە. لەو ماوەیەدا گەڕۆکێکی زۆر و جوگرافی زانی عەرەب بۆنموونە" ئیبنی حوقل لەدەورەی ئەبودەلۆف و ئیبنی بەتووتە و حەمدوڵای مستۆفی، زۆر کەسی دیکەش لە سەدەکاتنی دواتردا سەردانی ئێرانیان کردووە و لەمەڕ لوڕستان ئەوەی دیتوویانە و بیستوویانە یاداشتیان کردووە، بەڵام تەوەرەی باسەکەیان زۆرتر لەسەر جوگرافیایە.

"ئینگلبرت کیمپفەڕ" لە ساڵی ١٦٨٤ ز. لە دەورەی دەسەڵاتی شا سلێمان هەشتەمین پاشای دەورەی سەفەوی، هاتۆتە ئێران. لەتافی لاویدا چۆتە سوید و لە بەشی پزشکیدا دەستی کردووە بە خوێندن. لە تەمەنی ٣٢ ساڵیدا وەك مونشی (سکرتێر) و دکتۆر لەگەڵ شاندێکی سویدی سەردانی رووسیە و ئێرانی کردووە. لە نووسراوەکانی

خۆیدا بە ناوی "سەفەرنامەی کیمپفەڕ" زۆر بەوردی باسی دەرباری سەفەوییە دەکات. ئەو بە دڵی خۆی سەردانی لوڕستانی نەکردووە و زۆر بەکورتی لەو بارەیەوە چەند ئاماژەیەکی هەیە.

کیمپفەڕ لەسەر دەسەڵاتداری سەفەوییەکان و خان و بەگلەری ناوچەکانی ئێران چەند پەیڤێکی هەیە:

"لەنێو خان و بەگلەراندا، ئەو کەسانەی بەتەمەن و بەوەجن، پێیان دەڵێن والی. ئەمانەش بریتین لە والییەکانی گورجستان، خوزستان و لوڕستان."

دواتر دەنووسێ:

"ئەم والیانە لە ماڵباتی ناوداری پێش فەرمانڕەوای سەفەوییە بوون و هەرچەندە پێوەندیی ئەوان بە فەرمانی شا سەر دەگرێت، پاشا تەنیا ئەو کەسانە هەڵدەبژێرێت لە ماڵباتی والییەکان بن."

بارۆن دوبد" گەشتیاری رووسی کە دواتر باسی دەکەین، سەبارەت بە دەسەڵاتی والیی لوڕستان ئاوا دەنووسێ:

"تەنیا چوار والی روخسەدیان پێ درابوو لە بۆنە تایبەتەکاندا لە دەرباری سەفەوییە لە هەمبەر شادا دانیشن. ئەوانەش بریتی بوون لە: والییەکانی خوزستان، گورجستان، لوڕستان و ئەردەڵانی کوردستان."

کیمپفەڕ دەڵێ: جارێك شاسلێمان دەسەڵاتی لوڕستان بە خانێکی غەیرە لوڕ دەسپێرێ، بەڵام خەڵکەکە لەگەڵی نەحاوانەوە و لەکار و حوکماتی خانی تازە ڕازی نەبوون. لەگەڵی کەوتنە دژایەتی و شەڕ و ئاژاوە، لە کۆتاییدا خانیان ناچار کرد دەستی ماڵ و منداڵی بگرێ و بە تویی کراسێك بۆی دەرچێت.

***

شێخ محەمەد ئەبوتالیب ناسراو بە "حەزینی لاهیجی" لە ١١٠٣ ك.م. لە شاری ئیسفەهان هاتۆتە دنیا و لە دەورەی خۆیدا چۆتە بەر خوێندنی زانستەکانی باوی ئەوسەردەمە. چەند کۆپەڕی لەپاش بەجێ دەمێنێ، یەکێ لەو کتێبانە دیوانی شیعرەکانییەتی بە ناوی دیوانی لاهیجی، پاشکۆیەکی هەیە کە باسی مێژووە و سەفەرنامەی تێدا نووسراوە. لە دەورەی پشێونی ئسفەهاندا ژیاوە و ساڵی ١١٣٥

مانگی لە ڕێگەی ئیسفەهان و خوانسارەوە چۆتە خوڕەماوا. نێزیکەی دوو ساڵ لە و شارەدا ژیاوە. دواتر لە ترسی نادر شا، لە رێگەی بەندەر هەباسەوە خۆی گەیاندۆتە هیندستان. وەختێ ئەو خونکارە دەستی بەسەر هینددا گرت ئەو لەوێ ژیاوە. باسی ئەو وەختە دەگێڕێتەوە کە نەسروڵا میرزا، کوڕە چکۆلەی نادرشا لەگەڵ کیژی سوڵتانی هیند زەماوەندی کردووە. حەزین لە تەمەنی ٧٧ ساڵیدا لە شاری بنارۆسی هیند کۆچی دوایی دەکات. هەر لەوێ ئەسپەردەی دەکەن. سەبارەت بە سەردانی خوڕەماوا دەنووسێت:

"...لەگەڵ چەند کەسێك لە وەجاخزادەکاتن و دۆستان بەرگ و لیباسم گۆڕی و خۆم گەیاندە رستاق، یەکێ لە گوندەکاتنی شاری ئیسفەهان...زۆر بە ترس و لەرزەوە مەودای ڕێگەمان بڕی و بە زەحمەتێکی زۆر خۆمان گەیاندە خوانسار. لەبەرئەوەی سارد و سەرما و وەرزی زستان بوو و بەفر باریبوو، خۆمان گەرم داپێچا و بەرەو خوڕەماوای ژێر دەسەلاتی والیی لوڕستان وەڕێ کەوتین. ئەم ناوچەیە لە مەحەمەڕە نێزیکە و لەمەڕ ئاووهەواوە تابلێی دەڤەرێکی دڵگیر و سازگار و بەنێوبانگە...لەو کاتەدا میر و سەرداری ئەو موڵکە، عەلی مەردان خان کوڕی حوسێن خانی فەیلی لە ماڵباتی خانزادەکاتنی پێشووی دەسەلاتدارانی مەزنی دژ بە سەفەوی بوو..."

هەروەك حەزینی لاهیجی باسی کردووە، عەلی مەردان خان، لەو سەردەمانەدا هێزێکی باشی هەبووە، بەلام بەهۆی ئەو لەمپەرانەی حەزین ناویان ناهێنێت، نەیتوانیوە بۆ لەنێوبردنی هێزەکانی ئەفغانی یارمەتیی ئیسفەهان بدات. لە دەستنووسەکانی لاهیجی دا وا دەردەکەوێ، لە خوڕەماوا هێز و پێزی جەستەیی و هزری لاواز دەبێ و لەوانەیە تووشی فەرامۆشی هاتبێ، بەلام ماوەیەك دواتر خۆی دەگرێتەوە و دەچێتەوە نێو کۆڕ و جڤاتەکان و ئاوا دەنووسێ:

"بە گشتی لە خوڕەماوا کەسانێکی زۆر لە پیاو ماقووڵ و ژیر و بەبیران لەدەورم کۆبوونەوە و خان و میر و بەگلەران لەوپەڕی ڕێز و حورمەت و گەرم و گوڕیدا لەگەڵم دەکەوتنە راوێژ و تەگبیران و سەیر و سەیاحەتی گوند و باژێڕۆکانمان دەکرد و چێژمان وەردەگرت..."

لاهیجی لە سەردانەکەیدا بۆ خوڕەماوا باسی چاوپێکەوتنەکانی دەکات لەگەڵ میر سەیدعەلی موسەوی و میر سەید حوسێنی برای و کوڕەکانی سەی ئەفزەلی

میرعەزیزوڵای جەزایریدا. دەڵێ: ئەوکەسانە لەوپەڕی ژیری و بەوەجیدان و بۆ ناوچەکە و دەوروپشتی خۆیان سەیوانی ئاشتی و دلۆڤانی و تەباییبن. باسی قازی نیزامەدین عەلی خۆراسانیش دەکات لە شارەکەدا، دەڵێ قازی لەو شارەدا فێرگەی وانەگوتنەوەی دەبێ و حەزین لەلای ئەم زانایە دەرسی ئسولّی کافی و تەفسیری بەیزاوی دەخوێنێ. دیسا ئاوا دەنووسێ:

"... پتر لە دووساڵ لە شاری خوڕەماوا گیرسامەوە و لەگەڵ ژیر و ئاقڵمەندان کۆبوونەوە و دانیشتنی تایبەتمان هەبوو، بە ڕێز و حورمەتەوە لە فێرگەی جەنابی قازیدا بەشداریم دەکرد و ڕۆژگارمان بە شان و شکۆوە دەبردەسەر."

هەرلە درێژەی ئەم نووسینەدا باسی هێرشی سوپای عوسمانی دەکات بۆ سەر دەڤەرەکە:

"هێشتا لە خوڕەماوا بووم، پڕیشکەی ئاوری تالانچیانی عوسمانی ناوچەکەی گرتەوە و پێ و پل و پۆستاڵی نگریسیان لەسەر ئەم خاکە زێڕینە دانا."

بە وتەی حەزین، عەلی مەردان خان وەختێ هەستی بە لافاوی لەشکری عوسمانی کرد، زانیی خۆی لەبەر ڕاناگرێت، خۆی و سپاکەی و خزم و کەسی کۆ دەکاتەوە و پەنا دەباتەبەر چیاکان و شاری خوڕەماوا بە میرحوسێنی سیلورزی دەسپێرێت، دیارە ئەویش یەکێ لە سەردارەکانی تایەفەی خۆی بووە، تاکو ئەو شارەکە وێران بکات و خەڵکەکەی بۆ چیاکان ڕاگوێزێت. حەزینی لاهیجی ئاوا دەنووسێ:

"دانیشتوانی شارەکە تاڕادەیەك شڵەژان، بەڵام حەزیان نەدەکرد شار بەجێ بێڵن. زۆریش بڕوایان بە زەبر و زەنگی ڕۆمیان نەبوو. میرحوسێن خان هانای بۆ هێنام و خەڵکی شارەکەی کۆکردەوە...

وەختێ هەستم بە جووڵەی دانیشتوانی شار کرد و ڕوخساری ئەوانم خوێندەوە باوەڕم پتەو بوو، زانیم ڕاگوێزانی ئەو خەڵکە بەقازانج نییە و ئەوانیش ڕازی نابن ئەم ژینگە خۆشەیان لێ کاول ببێت... هەر بۆیە دەمزانی دەیانەوێ لەسەر ماڵ و حاڵی خۆیان بکوژرێن نەك لەبەر سەرمای شاخەکان ڕەق هەڵێن. ئەوەی لە دلّمدا بوو بە قازانجی ئەوان باسم کرد و پێم گوتن هەرکەسە و لە دار و بەرد و چەکی سارد و گەرم چیتان هەیە خۆ تەیار بکەن و وەك شوورەیەك لەبەرانبەر داگیرکەران ڕاوەستن..."

هەروەك حەزین باسی دەکات، کاتیك عوسمانیەکان بە سەر کردایەتیی ئەحمەدپاشا، ورە و لە خۆبوردوویی ئەم خەڵکەیان چاوپێکەوت و هێزی زۆری فەیلییان و ئەو کۆسپ و لەمپەرانەی بۆ پاراستنی شارەکە داندرابوون و ناوی سەردارانی بەبڕشتی ناوچەکەی بیستبوو. دەستی بە کڵاوی خۆیەوە گرت و وازی لە خوڕەماوا هێنا و پەلاماریان بردە سەر هەمەدان و نەهاوەند، دەستیان بەسەر ئەم دوو شارەدا گرت و ئەوەی وەبەریان هات دایانپاچین.

هەروەك لە نووسراوەکەی خۆیدا دەردەکەوێ لەو سەردەمەدا، حەزینی لاهیجی سەردانی هەمەدان دەکات و دۆستانی خۆی لە نێزیکەوە بەسەر دەکاتەوە، دواتر دەگەڕێتەوە بۆ نێو بەختیارییەکان، بەڵام بە وتەی خۆی لەو شارە دڵمەند دەبێ و دوای ئەو سەفەرە دەگەڕێتەوە بۆ یەمەن و بەسرە و شوشتەر. جارێکی دیکە دێتەوە لوڕستان. کاتێك دەگاتە خوڕەماوا شارێکی چۆڵ و هۆڵ دەبینێ و لە کۆتایدا دەنووسێ:

"... وەختێ لەگەڵ چەند خزمەتکارێك لەشەڕدا بووین، سەردار بە لەشکرێکی بێ ئەژماری ڕۆمیەوە گەیشتنێ، پێیان باش نەبوو بە تەنیا لە شاردا وەمێنم، لەگەڵ خۆیان بردمیان لەنێو سپاکەدا مامەوە...سەردار کەسێکی رۆمیی کردە دەسەڵاتدار و خۆی گەڕایەوە..."

ماوەیەك دواتر حەزینی لاهیجی لەگەڵ لەشکری عوسمانی بە خوڕەماوادا، دەچێتە کرماشان تاکو لەو شارەوە سەردانی شوێنە پیرۆزەکانی عێراق بکات.



دەکرێ بڵێین میر ئەولەتیف خانی شوشتەری، دوایین گەشتیارێك بووە کە لە دەورەی سەفەویدا سەردانی لوڕستانی کردووە و سەفەرنامەکەی خۆی نێوناوە "تحفەتولعالم". میر ئەولەتیف بەرەچەڵەك دەچێتەوە سەر وەجاخزادەکانی نووریەی شوشتەری و لە ساڵی ١١٧٢ ك.م. دا هاتۆتە دنیا و دوای خوێندن و فێربوونی ئەو زانستانەی لەو کاتەدا باو بوونە، زۆرینەی تەمەنی خۆی لە دەورەی ئەفشارییە و زەندییە بە سەیران و گەشتی نێوان ئێران و عێراق و عەمان و هیند، تێپەڕاندووە و لەگەڵ ژیر و زانایان دانیشتن و کۆبوونەوەی هەبووە. لە کەلکەتە و بەنگاڵ، کاروباری بازرگانیی کردووە و کەلوپەلی بۆ

خزم و کەس کڕیوە و بۆ ئێران و عێراقی ڕەوانە کردۆتەوە، لەو ڕێگەیەوە سامانی باشی وەسەر یەك ناوە. هەروەك خۆی باسی کردووە تاریفی ئینگلیزەکانی کردووە و داوای لە خەڵکی هیند کردووە سازگاری لە خۆنیشان بدەن و پێیان لەگەڵ ڕاکێشن. میر لە ۱۲۲۰ ك.م. دا لە هیندستانماڵئاوایی لە ئەم جیهانە کردووە.

بەپێی نووسراوەکانی میر ئەولەتیف، ئەو لە تەمەنی کەمتر لە ۳۰ساڵدا لە شوشتەر هاتۆتە دەرێ و چۆتە لوڕستانی فەیلی. دەڵێ لەو سەردەمەدا دەسەڵاتی لوڕستان بە دەست سمایل خانی کوڕی حوسێن خان لە بنەچەکەی سەفەوی و سەردارانی نادرشا بووە. لەدرێژەدا دەنووسێ: ئەو پیاوە پیرەمێردێکی دنیادیدەی ڕەشید و دلڕەق و خوێنمژ بووە. دیسان دەنووسێت: خەڵکی لوڕستان بە گشتیی لێی بێزار بوون و حەزیان دەکرد سەری پێوە نەبێ، ئەویش لەهەمبەر ئەواندا دەستی لە ئازار و چەوسانەوە و کوشتنی خەڵکەکە هەڵنەدەگرت. هەروەها بەو جۆرە ئەمە دەکاتە سەرباری سەفەرنامەکەی خۆی:

"سمایل خان سەری بۆ فەرمانی محەمەد کەریم خانی زەند نەوی نەکرد و، لەو کێو و شاخەدا لە ترسی پاشا خۆی شاردەوە. محەمەد خان و ئەسەد خانی کوڕی لەگەڵ خان و ڕەعیەتان پێك هاتن و ڕێچکەی تەباییان گرتەبەر..."

لەسەر لوڕستانی فەیلی یان پشتکۆ، بەوپەڕی جوانی و حورمەتەوە ناوی دەهێنی، ماوەی شازدە ڕۆژ بەڕێگەوە بووە تا گەیوەتە ناوچەکە و دوومانگ لە پشت چیا ماوەتەوە و چاوی کەوتووە بە تەواوی کانی و رووبار و تاڤگە و باخ و زەنوێران. دەڵێ لە سنوورەوە لەگەڵ بەغدا دراوسێیە و دانیشتووانەکەی سەد هەزار بنەماڵەن، هیچ وەختێکیش هێزی عوسمانی نەیتوانیوە دەست بەسەر موڵك وماڵی والیدا بگرێت. لەو دەورەیەدا کە میر ئەولەتیف لەپشت چیا بووە، دەسەڵاتی ناوچەکە لە دەست ئەسەدخاندا بووە. زۆریش باسی جوامێری و ئازایی ئەو مێرخاسەی کردووە. بۆ وێنە دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێك سێ شێر ئەسپەکانی ئەویان خواردووە و ئەویش دەگژ ئەو دڕندانە ڕاچووە. لە چاوتروکانێکدا تەقە لە دوانیان دەکات و دەیان کوژێ، دواتر بە شمشێر ئاخرین شێر پارچەپارچە دەکات. لە درێژەدا ئاوا دەنووسێ:

"... من لەوێوە هاتمە خوڕەماوا، خامە و تێنووس بەشی نووسین و پەسن و تاریفاتی خۆشی و جوانی و دلگیریی کەژ و بەژ و باخاتی ئەم دەڤەرە ناکات، لەموڵك و ماڵەوە

هەرچی ئەیبینی سەرنجڕاکێشە، هەمیشە نشینگەی والیان بووە و ژیر و بەبیرانی تێیدا نیشتەجێ بوون، بە تایبەت میرسەی عەلی جەزایەری...”

هەروەك لە نووسینەکانیدا دەردەکەوێ، جەزایەری لەسەر ویستی عەلی مەردان خان والیی لوڕستان، لە شوشتەرەوە هاتۆتە ئەوێ و بە حورمەت و شکۆوە ژیاوە و لە شەرع و ڕاڤە و لێکدانەوەی دینیدا شارەزا بووە و هەرلەو شارەدا کۆچی دوایی کردووە.

میر ئەولەتیف، لە خوڕەماوا لەگەڵ کەسێك بە ناوی هەباس خان برای سمایل خان والیی پێشووی پشتکۆ، هاونشین بووە. لەمەر ئەم هەباس خانەوە دەنووسێ: جلوبەرگی هەژار و دەروێشانی دەکردە بەری و خۆیلە کردە و کرداری نەفسی دەپاراست و شیعری جوانی دەهۆنییەوە و زۆریش حەزی لە تەنیایی و ڕەبەنی بوو. سەیرەکەش لەوەدا بووە داوا لە میر ئەولەتیف دەکات لێرە ژن بێنێ و بۆ هەمیشە لە خوڕەماوا بمێنێتەوە، بەڵام میر بە هۆی سەیرو سەفەرەوە ئەوەی لێ قبووڵ ناکات. هەر لە کتێبەکەی خۆیدا نایشارێتەوە و لەنێو ئەو سەیر و سەفەرەدا گیرۆدەی ئەوینی “کچە تەرسا”یەك دەبێ و زۆر بە زەحمەت موو دەپسێنێ و لە داوی ڕاوی ڕزگار دەبێت. ئەوسا میر ئەولەتیف دوای ٤٠ ڕۆژ مانەوە خوڕەماوا بەجێ دەهێڵێ و دەچێتە بروجێرد. ئاوا دەنووسێ:

“... چوومە بروجێرد لە محاڵی ئەلەشتەر، بەنداوێکی پڕئاوی پێدا دەڕوات تەواوی ئەم کێڵگە و باخاتە دڵگیرە پاراو دەکات. بەشێکی زۆر لە وەجاخزادەکاتنی تەباتەبایی لەو شارەدا دەژین. لەماوەی ئەو چەند ڕۆژە دا دەوریان چۆڵ نەکردم. یەکێ لەو بەڕێزانە بەناوی هادی خان، باخ و تەلارێکی خۆشی ساز کردبوو مردووی تێدا زیندوو دەبۆوە. مانگێکی ڕەبەق نەیهێشت بڕۆم و زۆری ڕێز و حورمەت گرتم. مرۆیەکی دڵاوا و خاوەن کەرەم بوو... ژیانێکی ڕێکوپێکی هەبوو. دوای ئەوەی ئیزنی دام، ماڵاواییم کرد و ڕێگەی کرماشانم گرتەبەر.

## (٢)

# گەشتیارانی سەدەی نۆزدەیەم

دوای تێکەوەپێچانی تۆماری ئیمپراتۆریی سەفەوی و ئاژاوەگێڕی و پەلامارەکانی هێزی ئەفغانی، ئێران ئالۆزی و جەنجاڵی و پشێویی تێکەوت. ئەوسا دەورەی کەس بەکەسی ئەفشارییە و زەندییە هاتە ئاراوە و، گەشتیارانی بیانی و دەرەکیی حەزێکی ئەوتۆیان نەمابوو بۆ سەیر و سەفەر، سەردانەکانی خۆیان بۆ وڵاتی ئێران پەك خست، بە تایبەت بۆ ناوچەی لوڕستان. ئەم ڕەوتەش هەتا گەیشتە دەورەی فەرمانڕەوایی قاجارەکان درێژەی کێشا.

هێوربوونەوەی وڵات و سەقامگیربوونی دەوڵەتی قاجار ، هاوکات بوو لەگەڵ دەورەی گەشەکردن و بەخۆداهاتنی ئەورووپیەکان و کۆنترۆڵی دەسەڵات بەسەر وەڵاتاندا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی گەڕۆکان بێن و سەردانی ئێران بکەن. لەڕاستیدا دەتوانین بێژین لەگەڵ هاتنی دەورەی قاجارییە دەروازەیەکی دوودەری بە رووی گەشتیاراندا کرایەوە.

سێرجان مەلکۆم ژێنراڵ و دیپلۆمات و مێژوونووسی ئینگلیزی، دەکرێ وەك یەکەم گەشتیارێك ناو بێنین کە لە دەورەی فەتەلی شای قاجاردا، بەرلە دەستپێکی شەڕی نێوان ئێران و رووسیە هاتۆتە وڵاتی ئێران. سەرەتا ساڵی ١٨٠٠ ز. بە پلەی سەروان (ملازم)، لەلایەن دەسەڵاتی گشتیی هیندوستانەوە هاتە وڵاتی ئێران، بۆ ئەوەی دژی ئەفغانەکان و کورتکردنەوەی دەستی فەرەنسییەکان پەیماننامەیەك واژۆ بکات. دیارە فەتەلیشا پێشوازیی لێ نەکرد. مەلکۆم، جارێکی دیکە لە ساڵی ١٨٠٧دا لەسەر فەرمانی کۆمپانی هیندی خۆرهەڵاتی ڕەوانەی بوشێەری ئێران دەکرێ، هەمدیس نەیتوانی لە دژی فەرەنسییەکان سەرکەوتنێك بەدەست بێنیت، هەربۆیە ناچار گەڕایەوە

بۆ هیند. بۆ جاری سێیەم لە ساڵی ١٨١٠ ز.دا لەگەڵ وەفدێك سەبارەت بە هەڵچنینی دیواری بیرۆکەی پێشوو سەفەری خۆی دەست پێکردەوە و توانیی نیشانەی (شێر و خورشید) لە فەتەلیشا وەربگرێت، دیارە ئەمەش بەناوی ئەو وەدی هات و لەگەڵ دووکەس لە لورستان گیرسانەوە.

سەروان (نەقیب) گرانت و ستوان (ملازم) فوترینگ هام، لەو یازدە کەسە بوون کە لەگەڵ مەلکۆم هاتبوونە ئێران. ئەو پیاوە ئەرکی کۆکردنەوەی زانیاریی لەسەر لورەکانیان خستە ئەستۆی ئەو دوو هاوکارەی. هەرچەندە لە رواڵەتدا ئەم دوو کەسە بەناوی گەشتیار هاتبوونە ئەم وڵاتە، بەڵان لە بنەوە بۆ کاروباری ڕامیاری و سەربازیی بریتانیا سەفەرەکەیان دەست پێکردبوو. هەربۆیە لە سۆنگەی سیخوڕیکردن بۆ ئینگلیز نەیانتوانی سەریان لەگەڵ خۆیان ببەنەوە!

سێرجان مەلکۆم، لە کتێبە پڕناوەرۆکەکەی خۆیدا بەناوی مێژووی ئێران، باسی پوختەی دەورانی دەسەڵاتدار و خونکاران دەکات لە سەرەتای مێژووڕا تا هاتنە سەر تەختی فەتەلیشا، بەم شێوەی خوارەوە:

"گەلانی ئێرانی بۆوێنە عەرەب، بروایان وایە لە بەر ئەوەی پارێزگاری لە هەرکەسێك بکەن پەیمان ناشکێنن و داڵدەی هەر کەسێك بدەن ناپاکیی پێ ناکەن. کەچی فێڵ و تەڵەکە و گزیکاریی کەلب عەلی خانی فەیلی ئەگەر ئەم کردارەی تێك نەڕووخاند، بەڵام توانیی هەرەسی پێ بێنێت. ئەو زۆڵە، دوو کەسی خاوەن پلەی لە نێزیك گوندی میوانداریەکەوە کوشت. هەرچەندە ئەو هەواڵە تەشەنەی سەند و بێزاریەکی تەواوی لێکەوتەوە، بەڵام حکوومەت نەیتوانی بیگرێ و ئەو بیژوە ئێستەش لە کوێستانەکان لە نێوان خوزستان و بەغدا خەریکی چەتەیی و ڕێگریی خۆیەتی. ئەوەی راستی بێت ئەم ناکەس بەچەیە ڕێز و حورمەتی ئێران و ئێرانی نەهێشتووە، وەك لوویەك وایە بە تەوێڵی حکوومەتی ئێرانەوە."

هۆی کوژرانی هەردوو راسپاردەی مەلکۆم بەبێ جیاوازی باس کرا. بە پێی دەوران راولینسن یەکەم کەس بوو لەنێزیکەوە ئاگەداری ئەم رووداوە بوو. هەروەك دیارە دوای تێپەڕبوونی ٢٥ ساڵ بە سەر ئەم ڕووداوەی کوژرانی گرانت و فوترینگ هامدا هێشتا کەسێك نەبووە لە ئەورووپاوە بێت و سەردانی ئەو ناوچەیە بکات. دوای ئەو ماوەیە

راولینسن توانیی لەگەڵ پەلێ سەرباز بێتە ئێران و سەردانی لوڕستان بکات، لەو سەفەرەیدا توانیی لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونێك بکات لەسەر چۆنێتیی کوژرانی هەردوو پیاوە ئینگلیزیەکەی هاووڵاتیی خۆی و زانیارییەك وەدەست بێنێت. بە بڕوای ئەو کەلب عەلی خان بۆیە گیانی ئەو دوو کەسەی سەند، ڕازی نەبوون لەسەر دەستی ئەو دینی ئیسلام قبووڵ بکەن.

لایارد، یەکێ لە فەرمانبەرانی بە زیپکوزاکوونی ئینگلیز بۆ ماوەی سێ ساڵ لەنێو یەختیاریەکاندا مایەوە و لە لاپەڕەکانی دواتردا نووسراوەکانی موتاڵا دەکەین، لە مەڕ کوژرانی خۆولاتیانەوە زۆر بە بڕشتانە هاتە پێشێ و باوەڕی وایە بەهۆی ئەوەی ئەو دوو کەسە بڕێك پارە و ئالتوونیان پێ بووە لە ناوچەکانی لوڕستان کەوتوونەتە بەر پەلاماری کەلبالی و کوژراون.

مورتنسن ی، دانیمارکی کە لە کۆتاییەکانی ئەم پەڕتووکەدا دەگەینە یاداشتەکانی، نووسیویەتی کەلب عەلی خان، دوای ئەوەی گرانت دەکوژێ بەتەما دەبێ ستوان فوترینگ هام ئازاد بکا، بەڵام دارو دەستەکەی رازی نابن و پێی دەڵێن ئەگەر ئەوکارە بکەی ستوانی ئینگلیزی دوای ئازادبوونەکەی بۆ تۆڵەسەندنەوە لە کەلب عەلی خان دەگەڕێتەوە، ئەویش بە قسەکەی ئەوان بە دارێکەوە شەتەکی دەدات و تیربارانی دەکات.



سەرهێنری کریس راوالینسن، خاوەن پلەی حکوومەتی و رۆژهەڵاتناسی بریتانی ئەوکەسەیە باری ئابووری و رامیاری و نەتەوەیی خەڵکی لوڕستانی بە خەستی نووسیوە و وەك سەفەرنامەیەك لە دوای خۆی بەجێی هێشتووە. نووسینەکانی ئەو گەڕۆکە چەندای چەند ساڵ وەك سەرچاوەیەکی بەپێز لەبارەی لوڕستان هاتۆتە ئەژمار و کەڵکی لێ وەرگیراوە. جێی خۆیەتی لێرەدا هەڵوێستەیەك بگرین و باشتر بیناسین.

راولینسن لە ساڵی ١٨١٠ ز. دا لە دایك بووە و لە ١٧ ساڵیەوە ئامادەیی خۆی دەردەبڕێ و دەچێتە نێو هێزی سەربازیی هیند و لەگەڵ سێرجان مەلکۆم دەچێتە ئەو وڵاتە و لە خزمەت کۆمپانیای هێندی خۆرهەڵاتیدا دەبێت. لەسەر دنەدانی مەلکۆم

تاسەی سەفەر بۆ ئێران دەیگرێ و فێری زمانی فارسی دەبێت. لە تەمەنی ٢٤ ساڵیدا لە سەرەتای چوونە سەر تەختی محەمەد شای قاجاردا توانیی ببێتە کەسێکی خاوەن پلە، ئەوسا حکوومەتی هێندی بریتانی بۆ ڕاهێنانی هێزی سەربازیی ئێران ڕەوانەی ئەم وڵاتەی کرد. نێزیکەی ٥ ساڵ لە خزمەت دەوڵەتی قاجاردا تێکەڵ بە لەشکری ئێران بوو. بۆ خزمەتکردن وەك فەرماندەی پەلێکی سەربازیی شازادە محەمەدعەلی میرزای دووەم کوڕی فەتەلیشای دەسەڵاتداری کرماشان، ڕەوانەی ئەو شارە کرا. بە بۆنەی مانەوەی لەو شارەدا، زەحمەتێکی زۆری کێشا و توانیی بەناخی تۆمار و بەردەنووسەکانی کەتیبەی داریوشدا لە بێستوون شۆڕ ببێتەوە و دوای چەند ساڵێك قفڵی دەرگەی خەتی بزماری بشکێنێ و بە وەرگێڕانی خەتی ئەم بەردەنووسە بۆ هەمیشە لە دنیادا ناوی لە مردن بپارێزێ و بە هەرمانی بمێنێتەوە. ماوەیەك دواتر توانیی پلەی سەر لەشکری بەدەست بێنێ و ببێتە وەزیر موختاری ئینگلستان لە ئێران. ساڵێك لەو پلە و مقامەدا مایەوە و لەمەولا وازی هێنا و گەڕایەوە بۆ لەندەن و ماوەی ژیانی سەر قاڵی کاروباری زانستی بوو، تاکو لەتەمەنی ٨٥ ساڵیدا سەری نایەوە.

لەو کاتەدا راولینسن لە کرماشان بوو، ئەرکی چوونە لوڕستای پێ ئەسپێردرا و لەگەڵ دەستەیەك سەربازی ئێرانی و محەمەد عەلی میرزا حاکمی ئەو شارە بۆ سەرکوتکردنی محەمەد تەقی خان بچێتە ناوچەی بەختیاری و بەسەر قەڵای توادا بدەن. لەو هەلومەرجەدا بوو راولینسن گوردی خۆی گرت و خۆی گەیاندە دەڤەری ئاڵۆزی لوڕستان. سەرەتا لە ڕێگەی زەهاو و شیروان یان هەر ئەوشارەی پێیان وایە ئەنەوشێرەوان بەردی بناخەکەی داناوە، چووە ناوچەی سەمیرە و قەڵای ڕەزە و پردی زاڵ و ساڵحاوا یان ئەندیمێشکی ئێستە، بەوێدا گەیشتە ناوەندی بەختیاری. دوای ئەوەی محەمەد تەقی خانی بەختیاری خۆی بەدەستەوە دا، مانگ و نیوێك مانەوە هەرلەم شوێنە، لە ڕێگەی شووش و دزفولەوە بەبێ هێزی سەربازی خۆی گەیاندە خورەماوا و لە ڕێگەی ئەلەشتەر و هەرسینەوە گەڕایەوە کزماشان. راولینسن سەربردەی ئەو سەیاحەتەی کۆپەڕەکەی خۆی بەناوی (گەشتێك لە زەهاو بۆ خوزستان) چاپ کرد، دواتریش وەرگێڕدرایە سەر زمانی فارسی. ئێستەش هەر لەسەر ئەم هێڵە دەچینە پێشێ.

راولینسن له لایەکەوە بەهۆی ئەوەی فارسی زان بووە، له لایەکی دیکەوە لەبەرئەوەی شارەزایی تەواوی هەبووە لەسەر خۆرئاوای ئێران و مێژووی کەونارای ئەم وڵاتە، سەفەرنامەکەی خۆی لەسەر بابەتی مێژوویی و زانستی جوگرافیایی دادەڕێژێت. سەبارەت بە هەڵسوکەوت و کولتوور و دابونەریتی هۆزەکانی ناوچەکە دەنووسێ و پشکنینێکی باش دەکات. بۆ وێنە وەختێ له دەشتی شیروان خەریکی لێکۆڵینەوە دەبێت لەسەر وێرانە و کاولاشەکانی مرۆی بەرێ، دەگاتە گۆڕخانەی یەکێ له خان و بەگلەرانی لوڕ له ناوچەکەدا. ئەمەش سەرنجی ڕادەکێشێ و دوای بە دواداچوونێکی تەواو بۆی ڕوون بۆتەوە ئەمە مەزارگەی یەکێك له خانەکانی پشتکۆیە. کاتی خۆی لەگەڵ کچی کوێخایەك دەزگیراندار دەبێ، ئەوڕۆژەی بۆ شایی و زەماوەند چۆتە ئاوایی تازەبووك، لەنێو ڕێدا نەخۆش دەکەوێت و دەمرێ. تازەبووکیش گۆڕێکی باشی بۆ دیاری دەکات و پەلکەی خۆی دەردێنێ و دەیدا بەسەر کێلی خانی جوانە مەرگیدا.

روالینسن دوای بەجێهێشتنی شیروان دەگاتە هۆردووی میرزا بوزورگ دەسەڵاتداری پشت چیا، له دەشتی سەمیرە و له تەنیشت رووبارەکە خێوەتیان هەڵداوە. بە گوێرەی وتەکانی راولینسن لەو چاخەدا کەلاوەکانی شاری سەمیرە یان بە وتەی لوڕەکان شاری خوسرەو پەروێز زۆر له شاری شیروان مەزنتر بووە.

ئەوسا له سەمیرەوە چۆتە جایدەر و سەردانی شازادە محەمەدعەلی میرزای کردووە، تاکو ئەوەی هێزە سەربازییەی کرماشان لێرە هۆردوویان هەڵداوە تێکەڵ دەستە سەربازەکانی خۆی بکات. لەوێوە لەگەڵ شازادە بچێتە خوزستان و ناوچەی بەختیاری. وەختێ دەچنە شوشتەر بۆ هەڵکوتانە سەر قەڵای مەنگشت، وەڕێ دەکەون. حەمەتەقی خان بەبێ دەستکردنەوە تەسلیمی محەمەد عەلی میرزا دەبێ و لەشکرکێشی کۆتایی دێت.

محەمەد عەلی میرزا ناسراو بە دەوڵەتشا دووەم کوڕی فەتەلیشا بوو، بەڵام بەهۆی ئەوەی دایکی گورجی بوو، دوای هەباس میرزا پلەی وەلیعهەدیان پێنەدا. محەمەد عەلی میرزا دوای ئەوەی هێزێکی زۆری بردە ناوچەی بەختیاری بۆ گرتنی بەغدا، لەشکری وەپێش خۆی دا، بەڵام له نیوەی ڕێگەدا نەخۆشیی چاوقووڵکە بەربینی پێگرت و له تەمەنی ٣٤ ساڵیدا حەیاتی لێ بڕی.

ئیجا، راولینسن دوای کۆتایی هاتنی شەڕ و ئاژاوەی حەمەتەقیخان لە ڕێگەی باغ مەلەك و شوشتەر دەچێتەوە دزفول و لەوێوە بەبێ هێزی سەربازی لەگەڵ دەستەیەك سەر دەکاتەوە بە خوڕەماوا دا. سەرەتا سەرێك لە "قیلاو" هەڵدەهێنێ. لێرە باسی کاولەکۆنەکانی شارێك دەکات بەناوی "ئەری ترین" کاتی خۆی یۆنانییەکان دوای هاتنی ئەسکەندەر دروستی دەکەن و دەیکەنە هەوارگەی خۆیان.

هەروەك چلە نووسینەکەیدا دەردەکەوێت دواتر دەچێتە ناوچەی پڕ لە مەترسیی دێرکۆوەند، لەوێ بە ڕۆژی ڕووناك خەڵك ڕووت دەکەن. سەرەڕای ئەوەی زۆریش وریای خۆیان بوون، دێرکۆوەندان شەوێ چوونەسەریان و لە تاریك و ڕوونی بەیانیدا دووکەسیان ڕووت کردن.

دوای ئەوەی لە چیای بێ ئاو و کێوی هەنارە و مەزارگەی "پیرۆمەر" وەك دەڵێن هەرکەسێك مار پێوەی بدات ژار بڕی دەکات و چاك دەبێتەوە، دێتە خوارێ و دەشتی تایی و چیای حەفتا پاڵوو بەجێ دەهێڵێت، دوای پێنج ڕۆژ بەپێیان لە دزفولەوە دەگاتە خوڕەماوا.

لەمەڕ ئەوشارەوە دەنووسێ: تابڵێی شوێنێکی بێوێنەیە. لەو ناوەندە زنارێکی هەڵەمووت هەڵکەوتووە گۆڕەپانەکەی نێزیکەی ۹۰۰ مەتری چوار گۆشەیە. قەڵای خوڕەماوا واتە شوێنی میرنشینی ئەتابەکان بە شێوەیەکی قورس و قایم سازکراوە و دووچین دیواری بەدەوری قەڵا کەدا کێشاوە. دەڵێن ئەو قەڵایە و بیناکانی دەوروبەری بە فەرمانی شازادە محەمەدعەلی میرزا دروست کراون. خوڕەماوا شارێکی تازەیە و نێزیکەی ۱۰۰۰ بنەماڵەی لەخۆ گرتووە. نووسراوەی سەر بەردەنووسی ئەو شارە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شوجاعەدین خورشیدی لە ریزی ئەتابەکانی لوڕستان، کە لە ساڵی ۵۸۰ ك.م. دا و لە دەورەی دەسەڵاتی خەلیفەکانی هەباسی لە ئێران، توانیی هۆزێکی بچووکی لوڕەکان بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. ئاماژەی کردووە کە لەسەر بەردەکە ناوی شوجاعەدینی خورشیدی خوێندۆتەوە.

بە وتەی راولینسن، ناوی خوڕەماوا لە نووسراوەکاندا بەر لە سەدەی چاردەی زایین بەرامبەر بە سەدەی هەشتی ك.م. نابیندرێت و لە هیچ سەرچاوەیەکدا تۆمار نەکراوە. چونکە پێش ئەو ڕێکەوتە ناوی ئەو شارە "سەم ها" یان " دزسیا" واتە دژی ڕەش، یان

قەڵای ڕەش بووە. هۆی ئەم ناوەش ئەوە بووە، قەڵاکەیان لەسەر زناریکی ڕەش هەڵچنیوە. ئەویش لەگەڵ جوگرافیزانان هاوبیر بووە کە ئەوشارە لە دەورەی ساسانیاندا بە "شاپور خواست" بەناوبانگ بووە. هەربۆیە دەنووسێ: لە خوڕەماوا هیچ بەردەنووس و سەرچاوەیەکمان دەست نەکەوت مێژووی سەرتای ئەو شارە لە پێش سەدەی یازدەی زایینیدا لەگەڵ سەدەی شەشەمی کوچی مانگی پێك بگرین. دواتر دەنووسێ: بەڵام خوڕەماوا لێرە جێی پرسیارە کە لوڕان باوەڕیان وایە ئەوشارە هەر "بەغستان"ـەکەی کەونارا بێت، بەڵام دیارە کە بەغستان دوای تێپەڕبوونی زەمان گۆڕا و بووبە بهەستان یان هەر ئەو بێستوونەی ئێستە.

راولینسن لە ئاشووڕناسیدا زۆر شارەزا بووە و لەسەر ئەوە سوورە کە " دزسیاە" هەر ئەو کێوە ڕەشە، ئەمەش بووە هۆی ئەوە یۆنایان لە دەورەی ئەسکەندەردا ناوی کۆسین لەسەر خۆیان دابنێن، واتە کاسییەکان هەر بۆیە بەم هۆزەیان گوتووە وڵاتی کاسییەکان.

هێنری راولینسن دوای ئەوەی لە خوڕەماوا دەچێتە دەرێ لە جادەی ڕۆباتەوە هاتۆتە پردی کەشکان و گوتویەتی، ئەو پردە لە شووڵ هەڵبەستراوە. بەسەر ئەو پردەدا پەڕیوەتەوە و سەردانی ئەلەشتەری کردووە و دەنووسێ: ئێرە دەشتێکی پان و بەرینە و لە شانی خۆرهەڵاتەوە پاڵ دەدا بە چیا دڵگیرەکانی چل نابالغانەوە. دەڵێ: ناولێنانی ئەو کێوانە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە چل منداڵ لێرە شەهیدکراون. باوەڕیان وایە ئەو چیا بەرزەی خۆرئاوای ئەلەشتەر لەکاتی خۆیدا کەشتییەکەی نووحی نەبی دوای تۆفانەکە لەسەر ئەم چیایە گیرساوەتەوە.

بە بڕوای راولینسن دەشتی پڕپیت و بەرەکەت و زەنوێری خاوە و ئەلەشتەر هەر ئەو شوێنەیە واتە "نیسین"ی سەردەمانی زوو، لەو زەماندا ئەسکەندەر لەکاتی گەڕانەکەیدا، لە شوشەوە بۆ بێستوون و هەمەدان، مانگیك ڕەشماڵی لێ هەڵداوە و سەیاحەتی کردووە. بە باوەڕی ئیسترابون جوگرافیزانی یۆنانی "نیسین" بەشە بەربڵاوەکانی ئەشتەر، ەورو، سیلاخۆر، بەربورود، چاپلاق و فەرەیدون، لە خۆی دەگرێت. هەڵبەت ئیسترابون لەباتی نیسین وشەی هیپوبوتوس بەکار دەهێنێ. کە بەیۆنانیکراوی سیلاخۆرە، لە سەرەتاوە "سیرئاخۆر، سیراخوڕ" بووە و دەشتێکی بە ناوبانگە.

سێر هێنری راولینسن، بەرلەوەی ناوچەی لوڕستان بەجێ بێڵێ و بچێتە هەرسین، بەکورتی لەسەر پیتاك وماڵیاتی لوڕستان و ڕێژەی ئەو لە دەورەی دەسەڵاتی میرزابوزورگدا لە پشت چیا ٦٠٥٠٠ تمەن لەگەڵ ١٧٧٠٠ خەڵوار دانەوێڵە یاداشت دەکات. ئەوسا کە خەلە، خەڵواری تمەنێك بووە، کۆی ماڵیاتی ساڵیانەی پشت چیا بەشی خوڕەماوا، سەمیرە، جایدەر، کۆدەشت، تەرحان و قەراب ٧٨٢٠٠ تمەن بووە، بەڵام ئەوکاتە حاکمی بێدەسەڵاتی خوڕەماوا نەیتوانیوە زیاتر لە ٢٠٠٠٠ لەو ناوچەیە کۆ بکاتەوە.

هەروەك دەزانین میرزا بزورگی دەسەڵاتداری خوڕەماوا بە مرۆیەکی کەللەڕەق و بێ ڕوحم و دڵ بە ناوبانگ بووە. پێشتر محەمەد شا، سەبارەت بەم خونکارە بۆ میرزا تەقی ئاشتیانی وەزیری کرماشانات، دەنووسێ:

"میرزا بزورگی قەزوێنی یەك دووجار پەیکی ناردووە پەیمانی خزمەتکردنی ڕاگەیاندووە. ئێمە بەو بەڕێزە ڕادەگەیەنین: هەروەك لە نووسراوەکەی خۆدا باسی لاساریی کردووە، دەبێ بلێی چەتە و تالانچیی ئەوێ و لوڕستان هەر شیاوی ئەوەن کە ئەویان بەسەرەوە بێت. ئیزنت پێ ئەدەم ماوەیەك لەگەڵی هەڵبکەی و شەیتان و ڕەحمان بە چاوی خۆت ببینی."

راولینسن دەڵێ: داهاتی زۆرینەی خەڵکی لوڕستان لە ڕێگەی بەخێوکردنی هێسترەوەیە، بەباوەڕی ئەو ئەو هێسترەی لە ناوچەی لوڕستان هەیە لە هیچ جێیەکی ئێران دەست ناکەوێت. خەڵکی لوڕستان لەساڵدا ١٠٠٠ سەر هێستر بەناوچەکانی ئێران دەفرۆشن. بێجگە لەوەش ئەوان خەریکی بەرهەمهێنانی خەڵووز و ئاژەڵدارین و شارەکانی هەمەدان و نەهاوەند و بروجێرد ڕەژی لە خەڵکی لوڕستان دەکڕن. ئەمەش داهاتێکی باشی هەیە بۆ لوڕەکان.

* * *

گەشتیاری فەرەنسی ئوژێن فلاندێن، ساڵی ١٨٤٠ ز. لە سەردەمی دەسەڵاتی محەمەدشای قاجاردا هاتۆتە ئێران. ئەو گەڕۆکە کتێبەکەی خۆی ناوناوە "سەفەرنامەی ئوژێن فلاندێن لە ئێران" ئاوا باسی سەفەرەکەی خۆی دەکات: لە ڕێگەی کەنگاوەر و

نەهاوەندەوە هاتۆتە بروجێرد و لەوێوە ویستوویەتی بە ڕێگەی خوڕەماوادا بچێتە لوڕستان و شوشتەر. بەڵان لەسەر ویستی شارەزایان و وەزیری بروجێرد سەفەرەکەی نەکردووە و وازی لێ هێناوە. هۆیەکەشی ئەوە بووە، وەزیر پێی دەڵێ لە لوڕستان بەبۆنەی شەڕی ناوخۆوە کەس خەتی کەس ناخوێنێتەوە و چوونی ئەوێ بەقازانج نییە، دەسەڵاتدارانی ناوەندی دەڤەرەکەیان بەجێ هێشتووە و هەرکەسە و بۆ خۆی قوولەبەگێکە!

فلاندێن دەڵێ: بروجێرد، وەك نەهاوەند جێیەکی پڕ داهاتە و خەڵکێکی زیت و زیندووی تێدا دەژی. دەنووسێ حەسارێکی باشیان بە دەوری شارەکەدا کێشاوە و چەند برج و قوتکەیان بۆ چاوەدێری هەیە و پێنج دەروازە لە ڕۆژدا بەرووی شارەکەدا دەکرێنەوە و بە شەویشدا کلۆم ئەدرێن. بەهۆی ئەوەی بەگلەربەگی ئەم شوێنە شازادەیە، ئەم شارە یەکێکە لە شارە گرینگەکانی ئێران. هەروەك ئاماژەی پێدەکات، هەرچەندە بروجێرد شارێکی بەناوبانگە، بەڵام بەهۆی کاولاشەکۆنەکانی و ئەوتەپوتۆزەی هەیەتی تاقەتی شازادەی قاجاری تێك داوە و حەز ناکات لەم شارەدا وەمێنێ، نووسەر مەبەستی یەکێ لە کوڕەکانی فەتەلیشایە.

جێی خۆیەتی خوێنەری ئەم پەڕتووکە ئەم خاڵە لەبیر نەکات کە جەنابی فەتەلیشا ٧٠٠ ژنی هەبووە. بە قسەی نووسەری مێژووی عەزدی، هەر شەوەی لەگەڵ ٦ ژنیان نووستووە و زۆر جاریش خۆیان لە ١٨ ژن داوە. ئەو پیاوە ئەوەندەی منداڵ خستۆتەوە هەر شارە و کوڕێکی بۆ داناوە. محەمەد تەقی لیسانولمولك نووسەری مێژووی ناسخوتەواریخ، گوتویەتی: لەو ڕۆژەوە ئەو پاشایە کە توانیویەتی لەگەڵ مێینەدا لە هۆدەیەك بنوێت، تا ئەو ساتەی پێمێردەی یەزدان(ئیزرایل) بەرۆکی گرت، ٤٧ ساڵی پێچوو. "لەو ماوە کەمەدا ئەو مرۆیە ٢٠٠٠ منداڵ و نەوەی لەدوای خۆی بەجێ هێشتووە. زۆرینەی ئەو منداڵانە بەر لە دنیادەرچوونی خۆی بارگەی سەفەریان بۆ هەمیشە تێکەوە پێچا." سا هەر ئەو نووسەرە لە کتێبەکەی خۆیدا ناوی ٥٧ کوڕ و ٤٦ کەنیشکی فەتەلیشای نووسیوە کە هێشتا دەستی فریشتەی گیانئەستێنیان پێ نەگەیوە و یەك بە یەك ناویان دەهێنێت و دەنووسێ: ئەو پیاوە ٥٨٠ نەوەی لێ کەوتۆتەوە. فەتەلیشا کوڕەکانی کردە فەرمانڕەوای شارەکان، بۆ ئەوەی لە لایەکەوە زنجیرەی

دەسەڵاتی قاجارییە نەپسێتەوە و وەجاغیان کوێر نەبێتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە شکۆی ئەم خانەدانە بەرز ڕابگرێ، دوای ئەمەش منداڵەکانی بە داهاتی خەڵکی هەژار و ڕەش و ڕووتی وڵات بەخێو بکات.

* * *

سێر ئوستن هێنری لایارد گەشتیاری ئینگلیزی، لە سەفەرنامەکەی خۆیدا بەناوی "سەفەرنامەی لایارد" یان ڕووداوەکانی بەرایی. لایارد خەڵکی ئینگلستان، بەڵام بەڕەگەز فەڕەنسەیی بوو. ساڵی ١٨١٧ لەدایك بووە. هەر لە مێرمنداڵیەوە هۆگرییەکی تایبەتی هیندستان بۆ خۆر هەڵات هەبووە. لە تەمەنی ٢٢ ساڵیدا لە بۆنەی چوونی بۆ سەیلان سەردانی وڵاتی ئێرانی کردووە. میرزا ئاغاسی سەدری ئەعزەمی محەمەدشای قاجاریە، ڕێگربووە لەگەڵ سەفەرکردنی ئەو بۆ سیستان و ئەفغانستان و. بارون دوبد مونشیی باڵوێزی رووسیە، دواتر دەچینە سەر یاداشتەکانی، هاوکاریی لایاردی کرد، تاکو بچێت و لەنێزیکەوە بەختیارییەکان ببینێت. لایارد ماوەی سێ ساڵ لە ناوچەی بەختیاری دا گیرسایەوە. دواتریش روون بۆوە دەستی هەبووە لە ئاژاوە و سەرهەڵدانی بەختیاری و شۆڕشەکەی محەمەد تەقی خاندا بە دژی حکوومەتی ناوەندی.

ئەمە بووە هۆی ناودەرکردنی لایارد، لە پلەی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز و نوێنەری پەرلەمان، توانیی شوێنی نەینەوای پێتەختی ئاشوور لە عێراق وەدۆزێت.

هەروەك لە نووسراوەکەی لایارددا هاتووە، ئەو لە ڕێگەی بەغداوە هاتۆتە کرماشان و هەمەدان و بروجێرد تاکو لەوێڕا بچێتە ئیسفەهان، لەگەڵ مەنوچێرخانی موعتەمودەولە دەسەڵاتداری ئەوسای ئیسفەهان چاوپێکەوتن بکات و لەوێوە بچێتە ناوچەی بەختیاری. ئەو گەڕۆکە لە ئوتی ١٨٤٠ ز. دەگاتە شاری بروجێرد، دەڵێ ئەوشارە زۆر ئاوەدانە و لە دەشتێکی زەنوێر و دڵگیر هەڵکەوتووە. شەو لە کاروانسەرای بروجێرد رۆژ دەکاتەوە. دەسەڵاتداری ئەوسای بروجێرد لە دەستی سەردار میرزا رەزا ناوێکدا دەبێ. لایارد داوا لە فەرمانڕەوای شار دەکات پەنجا کەس چاوەدێری بداتێ تاکو بەبێ ترس بتوانێ لە شووشەوە بچێتە دەڤەری لوڕستان، بەڵام ئاخری بەقسەی میرزا و ئاقڵمەندان لە دانیشتنەکەدا مەرزەم دەبێ و بە هۆی مەترسیی ڕێگە، واز بێنێ لە

ڕێگەی خوڕەماوا، بچێتە فەریدون و ئیسفەهان و بەوێدا سەردانی بەختیارییەکان بکات. لەمەڕ بروجێردەوە ئاوا دەنووسێت:

" دوانیوەڕۆ قەدرێکی باش بەنێو بازاڕی شاردا پیاسەم کرد. بروجێرد بازاڕێکی مەزنی هەیە و لە هەموو بابەتێك ئەوەی مرۆ پێویستی پێیەتی دەست دەکەوێ..بیست هەزار کەسی لە کۆشی خۆیدا حاواندۆتەوە و لەچاو شارەکانی ئەو پارێزگایە لە گشتیان مەزنترە...میوەی ئەم ناوچەیە بە نامیەیە، بەتایبەت کاڵەك و تریێ ڕەشکەی ورد و بەتامی."

لایارد، دوای ئەوەی بروجێرد بەجێ دەهێڵێ، دەچێتە خەسرەوئاوا. وەختێ دەگاتە ناوچەی لوڕستان، بۆی دەردەکەوێ عەشایری نیوە سەربەخۆی دەڤەرەکە زۆر دەربەستی حکوومەتی ناوەندی نین و وەڵامی دەسەڵاتی ناوەندی نادەنەوە و فەرمانی شا بە هێند وەرناگرن. تێکەڵ بە کاروانچیان دەبێ و دەچێتە ئیسفەهان، لەوێڕا سەردانی قەڵای تەپۆڵکە داکات و چاوی بە محەمەد تەقی خانی بەختیاری دەکەوێ.

زۆر بە پوختی باسی کولتوور و نەریتی بەختیارییەکان دەکات و چۆنییەتی دەستبەسەرکردنی محەمەد تەقیخان دەنووسێتەوە. دواتر دێتە دزفول و بە ڕێگەی پشتکۆدا خۆی دەگەیەنێتە بەغدا. لە دزفولەوە لەگەڵ ٢٣ سواری چەکدار بە سەرۆکایەتیی غوەلام عەلی بەگی لوڕی فەیلی دەگەڕێتەوە بۆ ڕەشماڵەکانی ئەوان، تاکو بە بۆنەی ئەوانەوە بچێتە پشت چیا. لایارد لە ماوەی ئەو سەفەرەیدا ناوی بۆ داود بەگ دەگۆڕێ. لە شوێنێك بەناوی "پای پل" لە کەرخە دەپەڕێتەوە و دەگاتە ناوچەی سەگوەندان، لە ترسی موعتەمەد دەسەڵاتداری ئەو کاتی ئیسفەهان و خوزستان و لوڕسان لەوەڕگەکانی خۆی بەجێ دەهێڵێ و لە پشت کێوەکان خۆی حەشاردەدات. شەوێ لە ڕەشماڵەکانی هۆزێکی بچووکدا بەناوی "موختاباز " دەیگوزەرێنی و دەنووسێت:

"لەگەڵ هاوڕێکانم میوانی چوار برا بووین، ئەوان بە ڕەبەنی دەژیان و خوشکی ١٧ ساڵەیان بە ناوی ئەشرەفی بناوان بوو. ئەم شۆخە پەلکە شۆڕە تا بلێی چاو ڕش و جوان بوو. ئەشرەفی بۆخۆی ئەشرەفی بوو، نەوەك ژنانی شار نەبوو، ڕووی خۆی بگرێ و شەرمێون بێت، لەگەڵ پیاوان دادەنیشت و زۆر جار لە تەك ئێمەدا دەکەوتە وتوویژ. ماڵێکی هەژار و بێ داهات بوون، دار و دەستەی دەسەڵاتداری لوڕستان بێ بەزەییانە

وەك هەڵاڵخانە رووتیان کردبوون. ئەشرەفی شێوی لێنایین و هەموو بەیەکەوە خواردمان و لەگەڵ براکانی نەیانزانی کەسێکی ئەورووپاییم."

لە ڕێگەی پشت چیاوە دەچێتە گوندی دێهلۆران لە مجالی لوڕستان و ژێر دەسەڵاتی عەلی خانی والی. لەوێوە دەگاتە مەزنە چیا و شوێنێك بەناوی شەکراو، والی و سێ ماڵ لەو شوێنە دامەزراون. لە ترسی هێرشی مەعتەمودەولە بۆ سەر لوڕستان خۆیان داڵدە دابوو. لایارد لەومیوانییەدا ڕێز و حورمەتێکی زۆر لە والی دەبینێ. بەپێی نووسراوەی خۆی لە پاڵ ئەو هەموو دلۆڤانییەدا زۆری پێ سەیردەبێ ئاوا بەخراپی باسی شەڕانخێوی و چەتەیی و ئینسانکوژی لوڕان دەکەن. لەم دوو بابەتە سەری سووڕ دەمێنێ. دەنووسێ عەلی خانی والی لەچاو شان و شکۆی خۆی پلەیەکی نزمتری بەرکەوتبوو. لایارد زۆر دەترسێ بیبینێت. لەبەرئەوەی عەلی خان حەز بەچارەی ئەورووپییەکان ناکات. لە درێژەدا دەنووسێ:

"دیوەخانی والی ڕەشماڵێکی مەزن بوو، والی لە سەروویی خێوەتەکە لەسەر فەرشێکی نەخشین دانیشتبوو، یەکێ لە مامۆستایانی ئاینی لوڕستان لە تەنیشتی پاڵی دابۆوە. لەو ژوورەدا بێجگە لە مەلا هیچ کەس ئیزنی ئەوەی نەبوو لە حزووری والی دانیشێت... لەپشت سەری والی خزمەتکار و چەکدارێکی زۆر بە چەك و چۆڵەوە کێشکچی بوون و ئەوەی دەیدیتن تەزوو بە لەشیدا داهات. لە دەم دەرگەی خێوەتی والی هەمیشە دەستەیەکی تێلا بەدەست لە ئەمر و نیای جەنابیدا ئامادە بوون، کێ تاوانبارە بیکوتن یان بیکوژن."

عەلی خان بە بێزاریەوە روو دەکاتە لایارد، دەپرسێ: بۆچی ئینگلیزەکان لە بەسرە قەڵایان ساز کردووە؟ هەرچەندە لایارد وەڵامی دەداتەوە بەڵان ئەو لێی قبووڵ ناکات و زیرەکانە روو دەکاتە دەوروبەری خۆی و دەڵێ: "باش بزانن، ئەو پیاوە ئینگلیزە وەك سیخوڕ هاتۆتە نێومان تاکو بارودۆخی وڵات و دەڤەرەکە هەڵسەنگێنێ و بە هەمووکەلێن و قوژبنێك بزانێ و سبەی بە هاسانی خەڵکی وڵاتەکەی بکێشێتە ئێرە". لایارد دیسا ئەنووسێ:

"لە تەنیشتی والی، مەلەك ئەحمەدخان سەرۆکی تایەفەی سەگوەند، کابرایەکی چەتە و پیاوکوژ بوو، دانیشتبوو، هەرچەندە بۆ مارەبڕینی کچەکەی لەگەڵ کوڕی والی لەو

کۆڕەدا ئامادە بوو، سەبارەت بە سەفەرەکەی من ملی نا لە پرسیارکردن و مانەوەم لە قەڵای سەرتەپۆڵکە. ئینجا بەو پەڕی بێحورمەتیەوە گوتی: مانەوەی ئەو کافرە لێرە دەبێتە هۆی نەهامەتی و ڕۆژەڕەشیی خانەکانی بەختیاری لە ناوچەکەدا."

ئەوسا، هاوڕێیان بە لایارد دەڵێن والی زۆر شانازی بە باب و باپیرانی خۆیەوە دەکات، تۆش وا نیشان بدە لە ئینگلستانەوە هاتووی لە خزمەت پیاوێکی ئاوا ڕەشید و ژیر و وڵاتپارێزی لوڕستاندا بی. کابرای بیانیش ئەم زمانە بەکار دێنێ و عەلی خان خۆشحاڵ دەکات. والی پێی دەڵێ کارێك نەکەی خەڵکی پشت چیا بزانن تۆ لێرە بیانیی. چونکە زۆرینەی دانیشتووانی ناوچەکە حەز بەچارەی ئەورووپیان ناکەن.

گەشتیاری ئینگلیزی دوای چەند ڕۆژ مانەوە لەنێو هۆردووی والی لەگەڵ چەند کەسێك لە هاوڕێیانی خۆی بۆ مولکی پاشای بەغدا وەڕێ دەکەوێت. لەنێو ڕێدا گۆڕستانی لوڕانی فەیلی دەبینێ لەسەر زۆر یەك لە گۆڕەکان سەرێکی نێری بەلەبۆز داندراوە و پەلکەی ژنانی ڕەشپۆش بە سەر کێلەکانەوە شۆڕ بوونەتەوە. لە کۆتاییدا باسی کەش و هەوای خۆشی مەزنە چیا و ڕووباری چەنگولە و سەر سنووری لوڕستانی فەیلی و عەرەبستانی لام دەکات و لە ناوچەکە دەچێتە دەرێ.



بارون دوبود یەکەم کەسێکە سەفەرنامەکەی خۆی لەسەر لوڕستان و خوزستان نووسیوە. لە دوای کوژرانی گریبایدۆف کاربەدەستەکەی رووسیە لە تاران، بوو بە کارمەندی باڵوێزخانەی رووسیە لە تاران. بە نووسراوەکانیدا وا دەردەکەوێ لە ئینگلستان مێژووی کەونارای تەواو کردبێ، ئەندامی ئەنجومەنی سەڵتەنەتی جوگرافیایی لەندەن بووە. ڕە نگە ئەم کارەشی دوای لە خۆ بوونەوەی کاروباری ڕامیاری کردبێت. دوای کۆتایی هاتنی شەڕی نێوان ئێران و رووسیە و ئاشتبوونەوە و سەقامگیری و هێمنی لە وڵاتدا، درەوازەیەك کرایەوە بۆ سەفەری گەشتیارانی بیانی و ئەویش سەردانی چەند ناوچەیەکی ئێرانی کرد. بۆوێنە بە کرماشان و خۆراسان و گورگان و هەمەدان و چەند شوێنێکی دیکەشدا گەڕا. بە هۆی ئەوەی لە زمانی فارسیدا تەواو شارەزا بوو دەیتوانی لەگەڵ خەڵکی ئێران لە هەموو کۆڕ و کۆبوونەوەیەکدا بەشدار بێت.

بە وتەی خۆی زۆر هۆگر و تامەزرۆی دیتنی نیشتەجێبوون و شارستانێتی هەخامەنیشیانی بووە و هەولّی زۆری داوە ژێنگەی دەولّەتی عیلام لە دەڤەری خوزستان و بەتایبەت لە ناوچەی بەرپێواری بەختیاریدا وەدۆزیّ و هەگبەی خۆی بخنیّ و بە دەستی پڕ بگەڕێتەوە بۆ ئەنجومەنی جوگرافیایی لەندەن.

دوبود لە سالّی ١٨٤٥ ز.دا لە دەورەی محەمەد شای شای قاجادا، بە بۆنەی شان و شکۆی دیپلۆماتی رووسیە لەو سەردەمەدا، هەروەها ئەو نامەیەی شا بەخەتی خۆی پێیدا بوو، لە سۆنگەی هەوای سەفەرکردن لەسەریدا، لە چیاکانی سنوورەوە دێتە خواریّ و ئەوسا مەنوچێرخانی موعتەمودەولە پشتی دەگرێت.

جێی خۆیەتی پێش ئەوەی باسی سەفەری بارو دوبود بکەین، چەند پەیڤێکمان هەبیّ لەسەر موعتەمودەولەی حاکمی لوڕستان. بەپێی نووسراوەکەی زۆراب ئەمیری، مەنوچێرخانی مەعتەمودەولە پیاوێکی بەناوبانگی دەورەی محەمەدشای قاجار، یەکیّ لەو دیلانە بوو وا ئاغا محەمەدخان لە سالّی ١٢٠٩ ک.م.دا لە تفلیس لەگەلّ خۆی هێنای بۆ ئێران. مەنوچێرخان لەیەکەم رۆژەوە لە دەرباری فەتەلیشادا یەکیّ بووە لە خواجەکانی حەرەمخانە رازاوەکەی ئەو کە دایم لەبەر ژنان جمەی هاتووە. بە هۆی ئەوەی مرۆیەکی ژیر و وردبین بووە لەکاراندا بۆتە بەرپرسی کاروباری نەریتە کۆمەلاّیەتیەکان. مەنوچێرخان لە کاتی مردنی فەتەلیشادا فەرمانڕەوای ڕەشت بووە و بۆ جێنشین دیاریکردنی پاشای کۆچکردوو لایەنی محەمەدشا دەگریّ و بە ٢٠٠٠ چەکداری خۆیەوە پالّ دەدا بە هۆردووی محەمەدشاوە. ئیتر تاکو ئەو رۆژەی سەردەنێتەوە سایەی پاشای قاجاری لەسەر کەم نابێت. ئەو پیاوە بەئەزموونە بێجگە لەوەی فەرمانڕەوای ئیسفەهان بوو، دەسەلاّتی لوڕستان و خوزستانیشی بەدەستەوە بووە. بە پێی نووسراوە مێژووییەکان موعتەمودەولە دڕندەترین خونکاری دەورەی قاجارەکان بووە.

موعتەمودەولە، لە کاتێکدا ڕێگەی بۆ سەفەری بارو دوبود خۆش کرد کە بچێتە ناوچەی بەختیاری، خۆی لەگەلّ هێزێکی سەربازی و تۆپچیانی ناوچەی ئیسفەهان سەردانی دەڤەرەکەی دەکرد. دوبود بە وریایی ئەو دەرفەتەی قۆستەوە و لە ڕێگەی قەلاّی سەر تەپۆلّکە و باغی مەلەك و شوشتەر و دزفولەوە خۆی گەیاندە لوڕستان.

هەر وەك لە نووسراوەکەی دوبوددا هاتووە، لە ڕێبەندانی ١٨٤٠ ز.دا ئەو دەمەی لایارد لەنێو بەختیارییەکاندا دەبێ، لە دزفولەوە دەچێتە خوڕەماوا. سەرەتا لادەداتە ڕەشماڵی سەگوەندەکاتن لە تایەفەی باجەلا و دەبێتە میوانی حەمەحوسێن خان کوێخان و دەمڕاستی ئاوەدانی و زۆر بە گەرم و گوڕی پێشوازیی لێ دەکرێت. دوبود دەڵێ ماوەیەك پێشتر سەگوەندان دەست دەکەن بە چەتەیی و تاڵانکردن و لەترسی تۆڵەلێکردنەوە دەچنە دزفول تاکو زۆراب خان داڵدەیان بدات.

دواتر لە ڕێگەی خۆیەوە دەچێتە قیلاو شوێنی ژیانی هۆزی دێکۆوەندان. لەوێوە دەگاتە هۆردوویی میرزا رەزای نووری، نوێنەری حاجی مەلا ئەحمەد، دەسەڵاتداری خوڕەماوا. هەروەك دەنووسێ لەو سەردەمەدا مەنوچێرخانی موعتەمودەولە فەرمانڕەوای لوڕستان بووە و، حاجی مەلا ئەحمەد بە فەرمانی ئەم خونکارە بۆتە دەسەڵاتداری لوڕستان. دوبود لێرەدا زۆر گەلەیی هەیە لە کردار و توندوتیژیی میرزا رەزای نووری و دەنووسێ: وەختێ ئەوان دەچن بۆ لای، باران دەبارێ، بۆ ئەوەی میوانەکان بە جلوبەرگی تەڕوبڕەوە نەچنە نێو ڕەشماڵەکەی، میرزا رەزای نووری بەو هەستەوە کە ئەوانە بیانی و گلاون، بە زمانی لوڕی فەرمان دەدات دوور لە ڕەشماڵەکەی خۆی خێوەتیان بۆ هەڵبدەن. نوێنەری باڵوێزخانەی رووسیە ئەم بێحورمەتیکردنەی زۆر پێ ناخۆش دەبێ و، بە توندی بەگژیدا دێت. دوبود لێرەدا بە لۆمە دەنووسێ:

“لە رووبە ووردبوونەوەی کەسگەلێکی ئێرانی وەك ئەو مرۆڤانەدا بۆم دەرکەوت مرۆڤ لەکن ئەو جۆرە کەسانە ئەگەر زۆر ڕێز و مرۆدۆستیی لە خۆی نیشان بدات، لە خۆیان دەردەچن و کەس بە هێند ناگرن، بەڵام ئەگەر لە هەمبەریاندا سەرنەوی نەکەی ئەوانیش خاو دەبنەوە و بە خۆیاندا دەچنەوە.”

دوای ئەم تووڕەبوونە، میرزا رەزای نووری بیر دەکاتەوە و بۆی دەردەکەوێ ئەو جێی باوەڕی موعتەمودەولەیە و خێرا هەوڵ دەدات پەشیمانیی خۆی نیشان بدات و دڵی بەدەست بێنێتەوە. دوبود زوو ڕووی خۆشی نیشان دەدات و بیر لەوە دەکاتەوە کە دەبێ بۆ درێژەدان بە سەفەرەکەی کەڵك لە خانە خوێ وەربگرێت.

گەشتیارە رووسییەکە بە باشی زانی میرزا رەزای نووری ڕێگەی بێ مەترسی بۆ دەستنیشان بکات، ئەوسا لە ڕێگەی جایدەر و، دەچێتە خوڕەماوا. تاکو لەنێو ڕێدا

سەردانێکی حاجی مەلائەحمەد دەسەڵاتداری خوڕەماوا بکات. هەروەك هەمیشە ئەو هیوایەی لە دڵدا بووە ناوچەی بەرپێواری نێوان جایدەر و خوڕەماوا ببینێت. ئەم پەلە پڕوزەیەشی بۆ ئەوە بووە، بەرلەو هیچ گەڕۆکێکی ئەورووپی ئەو ناوچەیەی نەپشکنیوە.

پیاوانی زۆراب خان دەسەڵاتداری دزفول، دوبود ڕەوانە دەکەن تاکو دەگاتە ئۆردووەکەی میرزا رەزا، لەوێرا دەیسپێرنە هەواڵبەرێکی دیکە تاکو بیباتە "ماین ڕۆ" بۆلای مەلائەحمەد. لەنێو ڕێدا دەگاتە قەڵای ڕەزە، وەختی خۆی حوسێن خانی والیی پشتکۆ سازی کردبوو، بەڵام دوبود لە چەشنی کاولاشێك دەیبینێت. ئەم گەشتیارە رووسییە ئەم چەند دێرە دەنووسیٚ: شایانی خوێندنەوەیە:

"لە نێزیك قەڵاکە، چاوم کەوت بە گۆڕی یازدە گۆرانی دێرکۆوەندی، لە کاتی خۆیدا بە فەرمانی میرزابزورگی فەرمانڕەوای ئەو کاتی لەسەر دزیکردن لەدار دەدرێن. بۆ ئەوەی دز و تالانچیان چیدیکە دەستدرێژی نەکەنە سەر ماڵی خەڵکی لەوە بەولاوە چەتە و گۆران وازبێنن لە ئاکاری دزێویان، لە گوێی ئەو ڕێگەیە دەیاننێژن. ئەگەر وابووبێتن مافی خۆیان بووە هەی گۆڕ، بەڵام ئەو کۆمەڵکوژییە دڵی مرۆڤ دەتەزێنێت.

"... لەسەر کێلی هەر مەزارێك پەلکەی ئافرەتێك هەڵواسراوە...گوتیان ئەو ژن و کچ و خوشکانەی خۆشەویستێکی خۆیان لەدەست دەدەن، بەنیشانەی پرسەباری پرچی خۆیان دەردەهێن و دەیدەن بەسەر کێلی گڵکۆی ئازیزانیاندا.

... بڕوا ناکەم لە هیچ نامیلکەیەکدا وایلۆکنامەیەکی لەو چەشنە دڵ هەژێنم خوێندبێتەوە و ئاوا سەرنجڕاکێشابێتم، پێشم وایە ئەوە شیاوترین شیننامەیە کە ئافرەتان دەی هۆننەوە و مۆرکی ژنانەی خۆیانی لیٚ دەدەن."

دوبود" دوای سەردانی قەڵای ڕەزە دەگاتە گوندی تایەفەیەك پێیان دەڵێن بۆئێرکۆەند، ڕەنگە هەر تایەفەی دێرکۆەند بووبێتن. لێرەدا باسی میوانگری ئەوان دەکات و حورمەتی خانە خویٚ، چۆن کاوڕی بۆ دەکوژێتەوە و بۆی کردووە بەکەبا. شەو لە کۆشی ڕەشماڵاندا رۆژی کردۆتەوە و بەیانی بە کاڕەی بەرخ و مەڕ خەبەری بۆتەوە. نووسیویەتی باسی ئەو شەوە ناخۆشە هەر ناکریٚ.

لە زەردە پەڕی ڕۆژی دوایەدا دەگاتە دۆڵی لەیلان و ڕەشماڵەکانی حەسەنوەندان شەوێ میوانی ژن و شوویەکی گەنج و دایکە پیرەی ئەوان دەبێت" ئەم کورتەیەش لەمەڕ ئەوانەوە دەنووسێت:

"کەمتر بینیومە لە خۆرهەڵاتدا کەسێك لەچەشنی ئەم دایکە دلۆڤان بێت دەەەمبەر بە کوڕی و وەك ئەوخاتوونە سەبارەت بە مێردی بە حورمەت و خاوەن وەفابن. لە دڵەوە دەبێژم لەنێو ئەو ماڵەدا تەنانەت کوێر هەست بە وەفا و ئەویینداری نێوان ئەم سێ کەسە دەکات... ڕۆژێك داوام لە خاوەن ماڵ کرد لەگەڵم بێت و بواری رووبارەکەم نیشان بدات، ژنی خانەخوێ بەبێ ماتڵ بوون ڕاپەڕی و لە ماوەیەکی کەمدا ئەسپی زین کرد و لەبەر دەرگەی خێوەتەکە دەستەونەزەر راوێستا، بە دەستێك هەوساری ئەسپ و بەو دەستەی دیکەی ئاوزەنگی ڕاگرت تاکو مێردەکەی سوار بێت و لەسەر زین دانیشێت. لەکاتی ماڵئاوایی کردندا دایکە پیرەی لێم پاڕایەوە ئاگام لە کوڕەکەی بێت. وەك ئەوەی بچێ بۆسەفەرێکی دوور و پڕمەترسی. دڵنیام هەمیشە دایکان وەختێ جگەرگۆشەکانیان لێیان دوور دەکەوێتەوە تووشی ئەم دڵەڕاوکێیە دەبن. باوەڕم وایە تەواوی حەز و ئەوینی دنیا لەسەر یەك هەڵبچنی لەچاو خۆشەویستیی دایك هێشتا چەند پلە نزمترە و ئەوینێکی بێ بەرانبەرە. لێرەدا هەرئەوەندە ماوە بڵێم، تەواوی ئەو وتانەی سەبارەت بە دزی و جەردەیی و دڕندەیی ئەو ناوچەیە بیستبووم باوەڕم پێی نەما و تەبایی و دلۆڤانیی ئەم خاووخێزانە پەنجەرەیەکی لە ڕووناکی و دۆستایەتی بەڕوومدا کردەوە. وەك بڵێی ئەوە شنەی مۆسیقایەك بوو ڕۆحی غەورگرتوومی شوشتەوە و ئۆخژنی دا بە هەناوم."

بارون دوبود، دوای پەڕینەوە لەو دۆڵە دەگاتە دەشتێکی زەنوێری جایدێر و ڕەشماڵی حەسەنوەندان. گوتویەتی ئەو ناوچەیە تاکو دەگاتە خوڕەماوا پێشتر دەستی هیچ گەڕۆکێکی وێ نەکەوتووە و لە پەڕتووکاندا ناوی نەهاتووە. لە کاتی پەڕینەوە لە چۆمی کەشکان تووشی چەرمەسەری و دەردیسەری دەبێت و هەوڵ دەدا سکەی ئاڵتون بدات بەو دە کەسەی لە ئاوەکە بیپەڕێننەوە، بەڵام بەڵەدەکاتن رازی نابن و داوای سکەی ساحەبقڕانی لێدەکەن، لەبەرئەوەی ئەوان نرخی سکەی ئاڵتوونی نازانن.

ئێوارەی ئەو ڕۆژە دەگاتە ڕەشماڵی وێسب وەندان و شەو لەگەڵ پیاوماقووڵان و ریش چەرمگانی ئەو گوندە دادەنیشێت. خەڵکەکە بۆنی گلەییيان لەدەم دێت بۆچی

گەشتیارانی فەرەنگی سەردانی ناوچەکەیان ناکەن. دوبود لە وەڵامدا دەڵێ: ئێرە دەڤەرێکی پڕمەترسییە و کوژرانی سەروان گرانت و ستوان فوترینگ هام، بووە هۆی ئەوەی کەس ڕوو نەکاتە ناوچەکە. پیرەپیاوێك دەڵێ بۆخۆم لەکاتی کوژرانی ئەو دوو ئینسانەدا لەوێ بووم کە بە فەرمانی کەلب عەلی خان کوژران. ئەو وختی بە عالەمی ئاشکرا لە دژی شا، یاغی ببوو.

جێگری یەکەمی رووسیە رۆژی دوایی دەگاتە هۆردووی حاجی مەلا ئەحمەد فەرمانڕەوای خوڕەماوا لە نێزیك کۆەدەشت، زۆر بەگەرمی پێشوازیی لێ دەکەن. دەنووسێ: پیاو بە ویژدانەوە دان بەڕاستیەکاندا بنێت، جگە لە چەند جارێك، هەردەم ڕێز و حورمەت و پیاوەتیم لە خەڵکی دلۆڤان و میوانگری ئێران دیتووە.

باسی هۆردووی مەلائەحمەد دەکات و دەڵێ، پەلێك لە سەربازانی تەورێز لە تایەفەی دلفان بە هەژماری ۱۲۰۰ کەس خەریکی خزمەت و ئامادەباش بوون. دەڵێ فەرماندەی ئەو پەلەی تەورێز لاوێکی ۱٦ ساڵانە و کاتی خۆی بابی ئەو کوڕە لەژێر سەیوانی خاوەنشکۆدا ژیا بوو. ڕەخنەیەك کە هێزی لە سەربازی ئێرانی دەگرێ ئەوەیە کە ئەو کەسانەی خاوەن پلە و پایەن ئەوانە نین خاوەنی ئەزموون و لێهاتوویی بن، یەکێ بابی میراخوڕ بووە و ئەویدی باپیری چاپچی و...، هەر بۆیە نیزامێکی ڕێکوپێکی نابینێت.

بە وتەی حاجی مەلا ئەحمەد، لەودەورەیەدا دەسەڵاتدارانی لوڕستانی بچووك، هاوینانە لە خوڕەماوا دادەنیشتن. یان لە زۆزان و لە تەك ڕەوەندانساڵیان دەبردە سەر. لە وەرزی زستانیشدا لەگەڵ خێڵەسات گەرمێن و کوێستانی کردووە. لە کۆدەشت و جایدێر هۆردوی نیزامی داناوە و تاکو هەمیشە ئاگەداری بە سەر کۆچەراندا هەبێ.

بارون دوبود، دوای ئەوەی هۆردووی نیزامی بەجێ دەهێڵێ، ڕەوەیەك ئەسپ وەردەگرێ و سەد سوار لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێ و روو دەکاتە خوڕەماوا و بروجێرد. دوا نیوەڕۆی ئەورۆژە دەگاتە گوندی "حەیات غەیب". لێرەدا گلەیی دەکات کە نەیتوانیوە لە گوندی حەیات غەیب کە ئاوایی سەیدانە نان بۆ سوارەکانی و تفاق بۆ ئەسپەکانی وەربگرێت. دوای ئەوەی لەم سەیداوایە دەچێتە دەرێ و دەگاتە شیو و دۆڵی "دلبەر" و مزلگرتن لەنێو ڕێدا، لەیەکەمی ڕەشەمەدا واتە ٦ ڕۆژ دوای ئەوەی لە دزفول هاتۆتە دەرێ دەگاتە خوڕەماوا.

سەرەتا لەو شارەدا بەرنووس لە بەردەنووسەکان هەڵدەگرێتەوە، بە دڵنیایەوە دەکرێ بڵێین ئەو کابرایە لە سەفەرنامەی خۆیدا باشترین و بێ هەڵەترین بەرنووسی لە بەردەکە هەڵگرتووە. بەداخەوە دواتر موزەفەرومولك دەسەڵاتداری خوڕەماوا بە خەتی فارسی ئەو بەردەی کۆڵی و نووسراوە کوفیەکەی تاڕادەیەك کوێر کردەوە، ئێستەش بە زەقی لەبەر چاوە.

دوبود شەوێ لە ماڵی کوێخایەکی خوڕەماوا میوان دەبێ، دەڵێ ناوچاوەکەم نەیهێنا و هێشتا بە چاکی لە ماڵی کوێخا لاقم ڕانەکێشابوو، لوڕان وەژوور کەوتن و جێ بۆ دانیشتن نەمابوو، ئەوان پرسیاری سەیر و سەمەرەیان دەکرد و منیش شەکەت و ماندوو چاوم لێڵی خەو بوو. ئەو پیاوە سەبارەت بە خوڕەماوا دەنووسێ: ئەو شارە چوار مزگەوت و هەشت گەرماو و شوێنێکی تایبەت بە جوولەکانی هەیە و نێزیکەی چل تا پەنجا ماڵ جوولەکەی تێدا دەژی. ڕەنگە ئێستەش بەساڵاچووانی خوڕەماوا لەبیریان مابێت هەر ئەو جوولەکانە بوون دەوا و دەرمانیان بۆ ئەو خەڵکە دەدیتەوە و نەخۆشەکانیان چاك دەکردنەوە، "ڕاستە شەقامی بروجێردیان" ئەم سەرتا ئەوسەر دووکان و بازاڕی ئەوان بوو، بە دارتاش و ئاسنگەر و مسگەر و کوتاڵ فرۆش و ئاڵتوونچییەوە. ئەوەی کار و پیشەیەکی دەزانی تەنیا جوولەکە بوو، ئەوان هیچ وەختێ خەریکی کاری وەرزێڕی و کشتوکاڵ نەدەبوون، کورد گوتەنی، جوویان نەگوتوە و جووتبەندە.

ئەم گەشتیارە رووسە بەچاوی خۆی لە قەڵای فەلەکولئەفلاك شەش قەبزە تۆپی دیتووە و دەنووسێ: وەختێ محەمەد شا دەستی گەیشتە دەسەڵات، فەرمانی کرد هەرچی تۆپ هەیە لە ناوچەکاندا بیبەن و لەتاران کۆیان بکەنەوە، بەڵام دەستی لەو تۆپانەندا، ئەو زۆر لە دۆستایەتی و وەفادارییی لوڕان دڵنیا بوو. هەروەك دوبود دەنووسێ هەر ئەو کێوەی بەسەر شارەکەی دا دەڕوانی دوو تۆپی زەردی لەسەر دابەسترابوو. ئەو شتانەی لە خوڕەماوا دا ئاڵوێر کراون ئەوانە بوون: دارسیگار و سەبیلە، چەرمی سمۆری ئاوی، دۆشاوی هەنار و ترێ ڕەشە. ئەوانەش لە باخاتی ناوچەکە بەرهەم هاتوون. تەنانەت تا ئەو سەردەمەی خۆشمان ئەم شتانەیان لە نێزیك نوێژگەی ناوەندی شار دادەنا و دەیان فرۆشت. دواتر دوبود دەچێتە بروجێرد. دیسان دەنووسێ: چەند ڕێگەیەك بروجێرد ئەگرێتەوە، بەڵام لە وەرزی سەرما و سۆڵەدا بەفر و بۆران ڕێگەی چیاکان دەبەستێ و

کاروانچی و ڕێبواران ناتوانن سەر دەربێنن. ئەو مەودایەی لوڕستان لە عێراقی عەجەم هەڵداوێرێت، ئەوانەن وا باسمان کردن.

دوبود، لەمەودای ڕێگەی خوڕەماوا تا بروجێرد، شەوێ لە کۆختەیەکی گوندی ڕەش لە نێوان وشکەڕۆدا ڕۆژ دەکاتەوە و دەڵێ: بەهۆی ئەوەی لێرە دارستانی لوڕستان کۆتایی دێت، خەڵکی ئەم بەشە بۆ سووتەمەنی کەڵك لە تەپاڵە وەدەگرن. ئەو گەڕۆکە لەگەڵ هەشت بەڵەدی ناوچەکە بەنێو بەفری چیاکاندا ڕێگەی بروجێرد دەگرێتە بەر. ئێستە لەو شوێنە لەزۆر جێ وڵاخ لە بەفر دەرناچێت، وەختێ لە هانیباڵ دەڕۆنە دەرێ دەڵێ ئەوەی لە کتێباندا دەمخوێندەوە ئێستە لە نێزیکەوە بە جەستە هەستی پێ دەکەم. دوای بڕینی ڕێگەیەکی زۆر و کەوتن و هەستانەوە لەنێو بەفرو ڕێبەندان و سەرمادا، دەگەنە گوندی بزن هەل، و دوای حەسانەوە، هەروەك خۆی دەڵێ بە دیوی دەشتی سەوزی بروجێرد و گوندەکاتندا شۆڕ دەبنەوە. لە نێزیك شارەکە چاوی دەکەوێ بە باخاتێکی زۆر و دوای ئەوەی خۆر لە خۆرنشین ئاوا دەبێ، دەگەنە بەر دەرگەی شاری بروجێرد.

شەو لە ماڵی مەزنی شارەکە هەرچەندە خان زۆرتر لە هەمەدان دادەنیشێت، میوان دەبێ. لێرەدا دەڵێ زۆری پێنەچوو هەروەك هەمیشە ژوورەکەم پڕبوو لە پیر و جەحێڵ، شەکەت و ماندوو ناچار بووم تاکو درەنگانێك گوێ بۆباس و دەمەتەقە دینی و مەزەبییەکانی ئەوان شل بکەم. ئەوانەی پشوودان و حەسانەوەیان لێ تێکدام، شەڕە دەنووکەیان لەسەر ئەوە بوو داخۆ مووسا لە پێشترە یان ئیبراهیم، ئەم خاسە یان ئەو خراو؟ وەك دەڵێن ئەوان هەولی لێفەکەی مەلایان بوو، تا من لە قەولی ئینجیلەوە شتێ بێژم. زۆری پێچوو هەتا رازیم کردن: تەورات دەڵێ ئیبراهیم لە عیسا و مووسا لەپێشترە. لەو کۆڕەدا تەنیا کەسێك بەقسەکەی من قەناعەتی کرد و ئەوسا هەستان و سەر و دڵیان بەردام.

بارون دوبود، بەیانی ئەو ڕۆژە سەرەتای مانگی ڕەمەزانە، زۆر چاوەڕوان دەبێت نانی بەیانی بدەنێ، بەڵام پێی دەڵێن ئەو مانگە مانگی ڕۆژووگرتن و پارێز و پەرستنە. دەڵێ خەڵکی ناوچەکە لە کاتی بەربانگدا یەکجار هۆگری نێرگەلەکێشان بوون و بەر لەوەی دەنگی تۆپ بێت هەر کەسە و ئامادە مۆدنەی نێرگەلەی خۆی لە قولی مستیدا بوو، تا لەگەڵ بیستنی دەنگی گرمەکە، دووکەڵ و بەرامەی ئەو مادەیە هەڵمژن.

ئەم کابرا گەڕۆکە دەنووسیٚ بروجێرد لە جادەی سەرەکیی بۆ پێتەختی ئێران و شارە مەزنکان لادەدا، هەربۆیە گەشتیارانی ئەورووپی کەمتر خۆیان لێداوە و لەمەڕ ئەو شارەوە هیچ یان نەنووسیوە. بروجێردی لەگەڵ محاڵی مەلایەر و هەمەدان بە ژێر دەسەڵاتی بهمەنمیرزا برای فەرمانڕەوا محەمەدشا لە قەڵەم داوە. هەروەك دەزانین هەباس میرزا ٤٨ منداڵی هەبووە تەنیا دوانیان لەگەڵ محەمەد شا لە دایکێك بوون: یەکیان بەهمەن میرزا و ئەوی دیکە قارەمان میرزای ناو بووە. دوبود دەڵیٚ، بەشەکانی سیلاخۆر، سەرلەك، ئاشناخۆر و جاپلاق لە کۆتاییدا دەگاتە فەرەیدون، ناوچەی بروجێردە. دەور وبەری بروجێرد زۆر ئاوەدانە و دانیشتوانیبشی هۆزی بەختیارین. سەر جەمی گوندەکاتنی دەڤەری بروجێرد بە مەزن و بچووکەوە ٣٨٦ ئاواییە و داهاتی پاشای ئێران لەم دێهاتە، نێزیکەی ٥٠٣٠٠ تمەن پووڵی نەغد و ٣٨٣٠ خەڵوار گەنم و جۆیە. نرخی جۆ لەو سەردەمەدا یەك تمەن و گەنم دوو تمەن نووسراوە.

نووسیویەتی، لەشاری بروجێرد پیشەی چنینی چیتی گوڵدار هەیە و زۆریش بە ناوبانگە بەڵام ناگاتە چیتی ئیسفەهان. با ئەمەش لەبیر نەکەین، کوتاڵ و چیتی بروجێرد بێجگە لەوەی پەسندی خەڵکی ئێرانە، لە بەشێکی زرۆی موسڵمان نشینی ئیمپراتۆری رووسیە مشتەریی بۆ پەیدا بووە و پێشوازیی لیٚ دەکەن. لە بروجێرد پەنجا کارگەی چاپی پارچەی لۆکەیی هەیە. ئەوانەش تایبەتن بە داراو دەوڵەمەندی شارەکە. بە وتەی گەشتیارەکە، جۆلاکانی بروجێرد لە ٦٠ قەوارە پارچەی چندراو و قەوارەیەك وەكماڵیات ڕەوانەی خەزانەی شا دەکەن. نەوەدوچوار گوندی پڕداهاتی تویسرکان بەرهەمهێنەری لۆکەن، بۆ چنینی کوتاڵی چیت.

بارون کلمنت ئوگستوس دوبود، پێش ئەوەی لە بروجێرد بچێتە دەریٚ و روو بکاتە سوڵتاناوا، زۆر بە پوختی لەسەر بارودۆخی جوگرافیایی لوڕستان و کولتووری خەڵکی ناوچەکە و ژیانی ئەوانی نووسیوە. پێدەچێت ئەوە یەکەم گەشتیارێك بووبێت هاتبێتە ناوچەکە و یاداشتی خۆی تۆمار کردبیٚ. دیارە لەو سەردەمەدا لوڕستان بە بروجێرد کۆتایی هاتووە و ئەو شارە کەوتۆتە ژێر فەرمانڕەوایی هەمەدانەوە. بەباوەڕی دوبود لوڕستان لە ئێراندا شاخاویترە نەك کوردستان. ئەمەش دەگێڕێتەوە بۆ بارودۆخی کەشوهەوای نێوان ئەڵوەند و بەشی کوێستان و گەرمێنەکەی مەزنە چیا.

بە بۆچوونی ئەو لوڕستان لە هەر بابەتێکەوە مەزنترین ناوچەیە، بە بۆنەی شاخاوی و کوێستانی بوونییەوە دوور بووە لە دەسەڵاتی ناوەندی و هاوکەوشەنی لەگەڵ عوسمانی و بێجگە لەوانەش ئازایەتیی خەڵکی ناوچەکە، بوونەتە هۆی ئەوەی فەرمانڕەوایانی ئێران بەشێوەیەکی دیکە حیسابی لەسەر بکەن.

سەبارەت بە خدە و ڕەوشتی لوڕان باوەڕی وایە ئەوانیش هەروەك داروسێکانی خۆیان (بەختیاری) خوویەکی چەتەیی و دزیکردنیان هەیە، بەڵام ئەوان وەك بەختیاری گەل بە ئاشکرا ڕێگری و جەردەیی ناکەن. لە کاتی هەڵمەت بردنیشدا لە چەشنی بەختیاری هەڵناکوتنە سەر خەڵکی، ئەوان بە سواری و لوڕان پیادەن. هەر بۆیە هاتوچۆکردن بۆ لوڕستان زۆر پڕ مەترسییە و لەچاو تەواوی ئێران جیاوازیی هەیە. سەبارەت بە خۆی دەنووسێ: پیاو بە ویژدانەوە قسە بکا، لەو ماوەیەدا لەگەڵیان بووم هیچ گلە و بناشتێکم لەو لوڕانە نییە. هەرچەندە ئەوکەسانەی لەگەڵ مندا بوون لە سێ چوار کەس تێ نەدەپەڕین، لە دەست هیچ هۆزێك حورمەت نەبێ ئازارم نەدیوە. لوڕان زۆر میوان گرن: "بەڵام دەبێ ئەمەش بڵێم ئەو کاتەی من هاتمە لوڕستان، ئەوان چاوەڕێی هاتنی فەرمانڕەوای گشتیی واتە موعتەمودەولە بوون".

لەمەڕ بیر باوەڕ و دین و مەزەبی لوڕەکانەوە بەهۆی ئەوەی زۆر لە نێویاندا نەبووە، بە خەستی بتوانێ شتێکی ئەوتۆ بنووسێتەوە. هەرئەوەی لە نێزیکەوە چی دیتووە یاداشتی کردووە. کە لوڕەکان شارەزایی زۆریان لەسەر مەزەب و سوننەتەکانی پێغەمبەر و شێوەی ژیانی عەلی نییە و گرینگیی پێنادەن. دابونەریتی لوڕەکان دەگێڕێتەوە بۆ ژیانی خێڵەکی و مەڕداری و گەرمێن و کوێستانێ. لوڕان زۆر بە زیت و بزۆز و تەنانەت وەختێ کەسێکی بیانی دەبینن، ڕوو هەڵماڵاوانە لەگەڵی بەرەو ڕوو دەبن. دەڵێ شارنشینان لەچاو خەڵکی لادێکان شەرمێون نین و زۆریش قسە لە ڕوون. دوبود، دەنووسێ: لوڕان هەر وەختێ غەریبەیەك ڕوو دەکاتە ڕەشماڵەکانیان زۆر بە گەرمی میوانداری لێدەکەن و بەوپەڕی حورمەتەوە قەدری دەگرن. دواتر دەنووسێ:

"ڕاستە کە بە دز و چەتە ناو بانگیان بڵاو بۆتەوە، بەڵام ئەوندەی من میوانی ئەوان بووم بە ڕوویی خۆشەوە لە تەنیشت سۆبای گەرم دایان دەنام و ئەوەی ئەوان نیشان

منیان دەدا ئەو ژیانە راستەقینەیە بوو کە لە ئەورووپادا دەوڵەمەندی و ژیانی ڕووکەشی درۆزنانە و خۆ لێ گۆڕان دایپۆشیبوو."



بەشێك لەو ژن و پیاوانەی لە وەزارەتەکانی ئێراندا کاریان بەدەست بووە و لە سەدەی نۆزدەی ئینگلیزدا خەریکی گەشت و سەیران بوون. بەرهەمی سەفەری خۆیان دواتر لە چاپ داوە و پەڕتووك خانەی جیهانیان پێ ڕازاندۆتەوە. لەونێوەدا جێی خۆیەتی ناوی مێری شیل هاوژینی سەرهەنگ جوستین بێنین. لە سەرەتای چوونە سەر دەسەڵاتی ناسرەدین شا دا، لەگەڵ مێردەکەی تەواوی ئێران بەسەر دەکاتەوە. مێری شیل نێزیکەی ٤ساڵ لە ئێران دەمێنێتەوە، دوای ئەوەی دەگەڕێتەوە بۆ ئینگلستان باسی سەفەرەکەی خۆی لە ساڵی ١٨٥٦ ز.دا، چاپ و بڵاو دەکاتەوە. ئەو خاتوونە بەسەرنجێکی وردەوە دەڕوانێتە دابونەریت و کولتووری خەڵکی ئێران بەگشتی و شێوەی ژیان و گوزەرانی رۆژهەڵاتی لە نێزیکەوە دەخوێنێتەوە. هەربۆیە ناوی کتێبەکەی دەنێ "نەریتی خەڵکی ئێران لە نێزیکەوە". هەر ئەم کتێبە لە ئێران بەناوی بیرەوەییەکانی لیدی شیل بە فارسی چاپ کراوە. لە کۆتاییدا سەرهەنگ شیل پەراوێزێکی خستە سەر پاشکۆی کتێبەکەی خێزانی.

مێری شیل لەو تاك و تەرا ژنانە بووە توانیویەتی خۆ لە ناسرەدین شا، نێزیك بکاتەوە. ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بووە، مێردەکەی لە ناوەندی کاروباری ڕامیاری ئێراندا شوێنی تایبەتاتی هەبووە. کەمەکێکیش لەسەر سیاسەدی ئێران دواوە. بەتایبەت لە ناواخنی کتێبەکەدا هەست دەکەی خێزانی لەگەڵ ئەمیر کەبیر دژایەتیی هەیە. سەرهەنگ شیل لە دەورەی محەمەدشا و سەرەتای دەسەڵاتی ناسرەدین شادا لە ئێران بووە. ماوەیەکی باش بۆ پشوودان دەڕوات و دواتر دەگەڕێتەوە ئێران. لەم سەفەرەیدا خێزانەکەشی لەگەڵ خۆی دەهێنێ و تا ساڵی ١٨٥٣ لە ئێران دەمێنێتەوە. سەرهەنگ شیل دوای ئەوەی دەگەڕێتەوە بۆ ئینگلستان، لە کاروباری سەربازیدا پلە بەرزەکانی بڕی و هەڵکشا و پلەی سەر لەشکری بەدەست هێنا.

ساڵی ١٨٥١ مێری شل لە سەفەرەکەی خۆیدا سەردانی گوڵپایەگان و ئیسفەهان دەکات. لەو سەفەرەیدا بە کورتی باسی لوڕستانی مەزن و لوڕستانی بچووك دەکات. لە سەرەتادا دەنووسێ:

"لەو کاتەدا گەیشتینە چیا و دۆڵە سەوزەکانی گوڵپایەگان، کوێستانە دڵگیرەکەی ناوچەی لوڕستان سەرنجڕاکێشاین، ئەم شوێنە خەڵکێکی خاوەن ڕەگەز و ڕەسەنی ئێرانی تێدا دەژی. ئەو خەڵکە ڕەشید و چاونەترسە لە دەستبزێوی و جەردەییدا تەنانەت دەستی تورکومانەکانیان لەپشتەوە بەستووە، بەڵام بە بۆنەی ناتەبایی ناوخۆ ئەوەی لە چەتەیی دەستیان دەکەوێت بە ئاسوودەیی نایخۆن...تەنانەت کارێکیان کردووە نە خۆیان تێروپڕن، نە دەرودراوسێ لە ترسی ئەوان ژیانی ئاسوودەیان هەیە و هەمیشە دەوروبەر لە ترسی ئەوان خەو لە چاویان ناکەوێت."

مێری دەنووسێ: چەند کەسێکی ئەورووپایی بە تامەزرۆییەوە هاتبوونە ناوچەکە تا لە نێزیکەوە چاویان بە ژیانی خێڵەکی و ڕەوەندان بکەوێ، بەڵام لە ترسی گیانی خۆیان ماندوویی ڕێگە لە جەستەیان دەرنەچووبوو و نەحەسابوونەوە، گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان. هەربۆیە نەیانتوانی لەسەر ژیانی خەڵکی لوڕستان کەوا بنەچەکەی ئەوان کاتی خۆی سوارچاك و جوامێری بەر لەشکری خەشایارشا بوون، ڕاڤە و لێکۆڵینەوەیەك بکەن.

مێری شیل لە زمان دکتۆرێکی ئەورووپاییەوە کە لە خزمەت محەمەد شادا بووە سەبارەت بە لوڕەکان دەگێڕێتەوە:

"ئەوانە خەڵکێکی جوانچاك و ڕەشید و خاوەن قەڵافەتن، تابڵێی دەست وەشێن و بێ ڕوحم و دڵن، دوور لەژیار و ژیرین، ئەوندە لە هەژاریدا دەژین جلوبەرگی پەڕپووت و نان و پیازێك بۆ ئەوان هەزار کلوور پارە و پووڵ دەژێت"

خاتوو مێری شیل باسی ئەفسەرێك دەکات ٢٠ ساڵ پێش سەفەری خۆی و مێردەکەی بۆگوڵپایەگان، خۆی لە لوڕەکانی بەختیاری کردۆتە موسڵمان و بەناوی "دەروێش عەلی" لەنێو خەڵکەکەدا جێی خۆی کردۆتەوە. دەروێش عەلی ژنێکی لوڕ دەخوازێ و دوای ماوەیەك ژنە بەختیاری لەسەر هێسترێك تەڵاق دەدات و یەکسمەکەش لە مێردی دووەمی ژنە دەستێنێ. لە زمان دەروێش عەلییەوە نەختۆکەیەك لەسەر ژیانی

خەڵکی لوڕستان باس دەکات و دەڵێ ئەو خەڵکە هەر هەموویان ماڵ بەکوڵ و ڕەشوڕووتن، خواردنیان نانی ئاردی بەڕووداره و لەسەر جلوبەرگیشیان زۆر ورد بۆتەوە.



گەشتیاری ئەم جارەمان مسیوچریکۆڤی رووسیه، کاتی خۆی وەك ناوبژیوانی نێوان سنووری ئێران ـــ عوسمانی هاتۆتە ئێران و سەردانی لوڕستانی کردووە. ئاشکرایه لە دەورەی تەیموری لەنگەوە ئاژاوەی سەر سنووری و کەوشەنی ساز بووە و نەبڕاوەتەوە و دواتر گەیوەتە قەرەقۆینلووەکان و سەفەویە و ئەفشاریە و قاجار. لە دەورەی محەمەدشای قاجاردا هەوڵێکی زۆر درا بۆ ساغکردنەوەی سنوورەکان و کۆتاییهێنان بەم کێشانە. هەرچەندە پەیماننامەیەك واژۆکرا، بەڵام ئەم شەڕە دەندووکە هەر دوایی نەهات. دەوڵەتی رووسیە و ئینگلیز بۆ ئەوەی بەرژەوەندی خۆیان لە دەوڵەتی ئێران و عوسمانیدا دەبینی کالّەیان هەڵکێشا و هاتنە مەیدان. جڤاتێکی چوارقۆڵییان پێك هێنا و نوێنەرانی رووسییە و ئینگلیز وەك ناوبژیوان تێیدا بەشدار بوون.

لێرەوە ناوی چریکۆف وەك فەرمانبەری رووسییە لە دانیشتنەکەدا بۆ نەهێشتنی کێشەی نێوان سنووری ئێران و عوسمانی دێتە گۆڕێ. چریکۆف لە ئەرتەشی رووسیەدا خاوەن پلەی سەر هەنگی بووە، زۆرتر بە مسیوچریکۆف ناو بانگی دەرکردووە. ئەو پیاوە لە ساڵی ٥٢ -١٨٤٨ز. بە ماوەی چوار ساڵ وەك سەرۆکی ناوبژیوانان، بۆ دیارکردنی بەشی سنووری ئێران و عوسمانی هەڵدەبژێردرێت. سەرهەنگ چریکۆف بە یارمەتی هاوکاری خۆی مسیوغەمارۆف خەریتەی خۆر ئاوای ئێران ئامادە دەکەن، لەو ماوەیەدا ئەوەی لە ڕۆژدا دەیبینێ و ئەیبیستێ یاداشتی دەکات. دوای مردنەکەی لە ساڵی ١٨٦٠ ز.دا هاوکارەکەی خۆی واتە غەمارۆف کۆی دەکاتەوە و چاپی دەکات. وەرگێڕێك بەناوی "ئابکار مەسیحی" ساڵی ١٣٠٥ ك.م. ئەو یاداشتانە لە زمانی رووسیەوە دەکاتە فارسی و بەناوی (سەیاحەتنامەی مسیوچریکۆف) و پێشکێش بە ناسرەدین شای دەکات.

بەپێی نووسراوەکەی چریکۆف، لە ڕێگەی ئاوی خوڕەمشارەوە دەپەڕێتەوە گەشتەکەی بۆ ئێران دەست پێ دەکات و سەفەرەکەی لە خۆرئاوای ئێران واتە لە کرێند و کرماشان و زەهاو و سنە و مەریوان کۆتایی دێت.

چریکۆف، وەختێ دەگاتە بەژی ئێران لە ڕێگەی ئەهوازەوە و دێتە دزفول و بە مەنگرەدا سەردانی لوڕستان و ناوچەکە بەگشتی و خوڕەماوا و بروجێرد دەکات. دواتر دەچێتە (سالحاوا) شاری ئەندیمێشکی ئێستە، چۆتە ناوچەی مەنگرە و باسی ناوچەکەی کردووە و چۆن ماڵەکانیان لە بناری چیاکاندا ساز کردووە و لەنێو باخەکاندا دەژین و بە ئاستەم تاتە بەردێك هەڵگێڕیەوە وەك شارەمێروو دووپشك دێنە دەرێ و ئەوندەی مار لەوێ هەیە ئەوەندەی خەڵك لێ ناژیت. نووسیویەتی، لە سێ لاوە ڕێگە هەیە بۆ خوڕەماوا، یەکەم لە تەنیشت بەنداوی سەمیرە، دووەم لە ڕێگەی سیسارکە کەچەڵەوە بۆ خان نەسی. سێیەم، لە نێوان ئەم دوانەدا چیای چاوونی یاداشت کردووە.

چریکۆف یەکەم ڕێگە، واتە لە سەمیرەوە سەفەری خۆی دەست پێدەکات. بە نێو دێرکۆوەندان و پاپیەکاندا دەگاتە مەزارگەی پیرۆمەر. سەبارەت بەو ئیمامزادەیە دەنووسێ: زۆر لەوە دەچێ ئەو پیرە، مارەکانی بە خێو کردبێ و دەستەمۆی کردبێتن، بەڵام لوڕەکان باوەڕیان وایە مار هەرکەسێك بگەزێ، ئەوپیرە چاکی دەکاتەوە و شمشێری پیرۆمەر ژاربڕ بووە و بەجێ دەمی ماریاندا هێناوە و ژهەرەکە ئەو کەسەی نەکوشتووە.

دواتر دەچێتە ئاوی زاڵ و چەند ئەشکەوتی سەیر و سەمەرە دەبینێ لە دوندی کێوی کەفکان و لە گەڕانەوەدا سەردانی ڕەشماڵانی هۆزی لوڕەکانی کردووە زۆری چێژ لە سەما و هەڵپەڕکێی ئەوان وەرگرتووە و ئەو سەماکردنەی بە هەڵپەڕکێی یۆنانیانی کەونارا دەشوبەینێت و دەنووسێ:

"شەوێ کردیانە هەرا و هەنگەمە و گوڕە و هەرایەك سەگ ساحەبی خۆی نەدەناسی، ئەم فەرتەنەیەشیان بۆیە نایەوە ئێمە ڕووت بکەن، بەڵام چاودێرەکانی ئێمە زۆر لەوان وریاتر بوون."

لە دێکەی تافەوە دەچێتە دەشتی خوڕەماوا. دوای کورتە باسێك لەسەر منارەی ۲۵ زەرعی و بەردەنووسەکانی ئەوشارە و پاشماوەی کاولە کۆنان، دەگاتە خوڕەماوا.

سەرجەمی هۆزی لوڕان ٦٠ تایەفە دەنووسیٚ و دەڵیٚ، چەنگیان بۆ دەستوەشیٚنی جەردەیی ناوبانگی خۆیان هەیە. ناو بیرانوەند و باجولوەند، وەك بەناوبانگترین تایەفە دیٚنیٚت. دەڵیٚ ئەوانە لە هۆزی پەروانەوەند و باجەلان وەندن. زۆر بەوردی باسی دوژمنایەتی نیٚوان تایەفەی باڵاگریٚوە و عەمەلە و سەرجەمی تایەفەی دلفان دەكات.

بەوتەی مسیوچریكۆف، لەو سەردەمەدا ئەردەشیٚر میرزا نۆیەم كوڕی هەباس میرزا، مامی ناسرەدین شا فەرمانڕەوای لوڕستان دەبیٚت، بەڵام دەسەڵاتداری راستەقینە كەسیٚك بووە بەناوی سلیٚمان خان. ئەو شویٚنەش هاوینهەەواری بیرانوەند و باجولوەندەكاتن بووە لە باكووری خوڕەماوادا. ئەو سەربازە چەكدارانەی لە خوڕەماوا دا بوون ١٠٠٠٠ كەس بوون و لە دۆڵی كرەگا هۆردوویان لیٚداوە و لە قەڵای شار یان فەلەكولئەفلاك دوو عەرابە تۆپ دامەزراوە. هەروەك دەنووسیٚ ماوەیەك پیٚشتر تایەفەی چنگی گەرماوی شاریان ویٚران كردووە.

چریكۆف، دوای ئەوە ڕیٚگەی بروجیٚرد دەگریٚتە بەر و لە نیو فرسەخی شار دەگاتە هۆردوویی ئەردەشیر میرزا، تا چاوی بە شازادە بكەویٚت. لەنیٚو خیٚوەتەكاندا خیٚوەتی خاوەنشكۆ دەبینیٚ، بەڵام خیٚوەتی سەربازەكان زۆر بە شپرێوی هەریەكەی لەلایەك. بە پیٚی نووسینی ئەو گەڕۆكە رووسیە هۆی هاتنی شازادە بۆ دەڤەری لوڕستان ئەوە بووە، كە ماوەیەك پیٚش چوونی ئەو زەینەڵعابیدین خان سەرۆك هۆزی بیرانوەند براكەی خۆی بە ناوی حوسیٚن خان دەگریٚ و ڕادەستی هیٚزی دەوڵەتی دەكات، تا چاو ترسیٚنی بكەن و حوسیٚن خان گوندەكاتنی دەوروبەری بروجیٚرد تاڵان دەكات، ئەوانیش لە ناكاودا هەڵدەكوتنە سەری و دەیگرن. پیٚنسەد لوڕی ئازا بۆ تۆڵە سەندنەوەی حوسیٚن خان ئەدەن بەسەر زەونەڵعابیدیندا، بەڵام ئەویش كوڕانە بۆی دەردەچیٚ و ئەوەی بەجیٚی دەهیٚڵیٚت دەست لوڕان دەكەویٚ. هەر ئەو دەستەیە ماوەیەك دواتر هەواڵبەریٚك ڕووت دەكەن. ئیٚستەش ئەردەشیٚر میرزا ٧٠٠ سەرباز و دووعەڕابە تۆپی بۆ تەمبیٚكردنی ئەو تاڵان چیانە. ئەردەشیٚرمیرزا بە چریكۆف دەڵیٚ: كاتی خۆی شاری خوڕەماوا كەسیٚك سازی كردووە بەناوی "خوڕەمشا" هەندیٚكیش دەڵیٚن پشتر ئیٚرە زەریاچە بووە و وەختیٚ وشكاوی هاتووە بۆتە دەشتیٚكی زەنویٚر و سەوزەڵانی. ئەو پیاوە رووسییە لە ڕیٚگەی بروجیٚردەوە سەردانی ڕەشماڵەكانی سمایل خانی كردووە. هەر ئەو پیاوەی پیٚنسەد

چەکداری لوڕی بە گژ مامیداکرد واتە زەینەلّعابدین، تاکو سامانەکەی تالاّن بکەن. لەویّ بە چریکۆف دەلیّ دەمەویّ ئەو داراییەی دەستم بە سەردا گرتووە سەر لەبەری پێشکێش بە شازادە ئەردەشێری بکەم، تاکو لە سایەی شاهانەی زۆرتر بەهرەمەند بێت. ئەمەش دەسەلمێنێت کە هۆزی بیراوەند و باجولوەند هەرچەندە لە تایەفەی بالاّگریوەنین، بەلاّم خزمن و لە خێر و شەڕی یەکدیدا پشت هەلّناکەن و هاوپەیمانن.

چریکۆف، بە ڕێگەی "هۆرو"دا دەگاتە هەورازەکان و دەگاتە مولّکی بروجێرد و شیو و دۆلّی سیلاخۆر. لێرەوە دەلیّ ئاوایی زۆرە و بەهەر لایەکدا بڕوانی باخاتە و شار کەوتۆتە ئامێزی باخەکانەوە:

"بروجێرد لە دەشتێکی بەریندا هەلّکەوتووە و چەند کانیاوێك کەوتۆتە ناوەندی شارەکەوە. دەسەلاّتداری بروجێرد کوڕێژگەیەکی حەوت سالاّنەیە بەناوی جەلالەدین میرزا، کوڕی خانلەر میرزا مامی شایە. دیدەنی ئەمیرزادەم کرد، میرزا زەینەلّ عابیدین خان لەلە و وەزیری ئەمیرزادە لە تەنیشتی دانیشتبوو... زەینەلعابیدین لە تەرخان هاتۆتە دینا و زمانی رووسی زۆر بەباشی دەزانێت."

مسیو چریکۆف، دوای چەند ڕۆژ مانەوە لە بروجێرد لە ڕێگەی سارینچە وە دەچێتە گولّپایەگان و بەوێدا سەردانی ئیسفەهان دەکات و لە مولّکی لوڕستان دەچێتە دەریّ.

* * *

لە دەورەی پەنجا سالّ فەرمانڕەوایی ناسرەدین شادا، ئەو ماوە زۆرە تا ڕادەیەك وای کرد هێمنییەکی هەرچەندە کەمیش، بالّ بەسەر ولاّتدا بکێشێت و هاوکاتی پەرەسەندنی دەسەلاّتی پادشایی، بووە هۆی بووژانەوەی کاروباری بازرگانی و فەرهەنگی ئەورووپاییان لە ئێران، ئەوە وای کرد کەش و هەوای پێشتر بڕەوێتەوە و گەشتیارێکی زۆر روو بکەنە ولاّتی ئێران. یەکیّ لەو کەسانەی کە لێرەدا باسی دەکەین "یاکوب ئیدوارد پولاك"ی خەلّکی بوهەمە. لەو سەردەمەدا پولاك سەردانی ئێرانی کردووە، بوهەم بەشێك بووە لە مولّکی ئوتریش، بەلاّم ئێستە لکێنراوە بە چێکۆسلۆڤاکیاوە. پولاك سالّی ١٨١٨ لە دایك بووە و ٧٣ سالّ ژیاوە. سالّی ١٨٥١ ز، هاتۆتە ئێران و دە سالّ ماوەتەوە. ماوەیەکیش پزیشکی ناسرەدین شا بووە. لەو ماوەیەدا کە لە ئێران ژیاوە لە پیشەکەی

خۆیدا کۆمەڵێك قوتابیی پەروەردە کردووە. زۆر بابەتی لەسەر پزشکی نووسیوە، دواتر قوتابییەکانی تەرجومەیان کردووە و کتێبخانەی ئێرانیان پێ ڕازاوەتر کردووە.

مانەوەی زۆری پولاك لە ئێران و پێشینەی ئەو لە بواری دکتۆری یان هەروەك خۆی دەیگوت دەرمانسازیدا، بووە هۆی ئەوەی لە گەشتنامەکەیدا زانیارییەکی باش سەبارەت بە نەخۆشییەکان و شێوەی چارەسەرکردنیان، بەتایبەت نەخۆشینە گیرەوەکان، بەهرەیەکی باش بە خوێندکارانی ئەو سەردەمە ببەخشێت و کتێبەکەی بە ژیان و دابونەریت و خواردنەکانی ئێرانی دەوڵەمەندتر بکات.

کەیکاوس جەهانداری وەرگێڕی سەفەرنامەی پولاك، بە پشتبەستن بە ڕۆژنامەی ڕووداوەکانی سەردەم دەڵێ: دکتۆر پولاك بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٢٧٤ ك.م.دا، تۆوی چەوەندەری قەندی هێنایە ئێران. دەستی کرد بە پەرەپێدان و گەشە پێدانی ئەم ڕووەکە.

پولاك دوای دەساڵ مانەوە لە ئێران، ئەم وڵاتە بەجێ دەهێڵێ و بیست ساڵ دواتر دەگەڕێتەوە. لەم سەفەرەی دواییەدا لە ناوچەی ئەلوەند زۆر بەبڕشتانە خەریکی لێکۆڵینەوە و شیکاری ناوچەکە دەبێت. لە دواییەدا دەچێتە ویێەن و دەبێتە مامۆستای زمانی فارسی. ئەو مرۆڤە ئینساندۆستە نووسراوەکانی خۆی بەناوی "سەفەرنامەی پولاك" (ئێران و ئێرانیان)، بەزمانی ئەڵمانی بڵاو دەکاتەوە.

ئاماژەی پولاك لەمەڕ لوڕستان، پوخت و بەپێزە. ئەو گەل و هۆزەکانی ئێران بە ١٨ دەستە دابەش دەکات، سەرەتا باسی ئەو کەسانە دەکات بۆ یەکەم جار لە خاکی ئێراندا ژیاون. واتە فاس و مادەکاتن، گاورەکانی یەزد و کرمان وەك نموونەی فارسان دەهێنێتەوە. دەڵێ لوڕ و لەك لە فاسان زۆر نێزیکن. لە قسەکردن و ئاخاڤتنی خێڵەکی و ڕەوەندی نەژاد ئێرانی، لوڕ و بەختیاری بە نموونە دەهێنێتەوە. ئەوسا ئاماژە دەکاتە سەر قۆڵبەستکرانی خانەکانی لوڕ و بەختیاری و دەنووسێ: هۆی وێرانی حەشارگەکانی ئەوان زۆربوونی داهات و سامانی ناوچەکەیە.

سەبارەت بەبێ غەل و غەشی ئەوان لەمەڕ مانگی موحەڕەم و بێزارییان لە یەزید دەنووسێ:

"لە زۆر شوێنی لوڕستان کە هێشتا مژی ژیاری وەسەر نەکشاوە، وەك ئەوەی شتی سەیر و سەمەرە رووبدات وایە. ئەو کەسانەی لەو ڕۆژەدا دەوری یەزیدیان دەگێڕا تەماشاچیەکانیش هێندەیان لێ بێزار دەبوون، هەر ئەوەندە بوو نەیان دەکوشتن. "



ئێستەش جێی خۆیەتی چاوێك بخشێنین بەسەر ئەوسەفەرنامانەدا کەوا سەبارەت بە ئێران نووسراون. زۆریەك بەشێکی زۆری ئەم سەفەرنامانە شیاوی سەرنجن. لەسەرروویی هەموویانەوە باش وایە ناوی ناسرەدین شا بێنین. وەك یەکەم پاشای ئێران، سەفەری کردووە بۆ ئەورووپا یان هەروەك خۆی دەیگوت، ولاتی فەرەنگ. زۆری حەز لە سەفەرکردن هەبووە و لە خەزانەی دەولەتی بە کەیفی خۆی خەرجی کردووە، وەك دەلێن گوللە و دەرمانی بایزاغا شەق لە کەندەلانی. بەبۆنەی ئەو سەفەرانەوە کانەکانی ئێران کردە بارمتە و ڕێگەی بۆ کۆلۆنیالیزم کردەوە هەرد و بەردی ئێران بکۆلن و جانتای خۆیان لە گەوهەری ئێران بئاخنن.

شای قاجار بێجگە لە سەفەری فەرەنگ، بە ناوچەکانی ئێراندا گەڕا، تاکو لە ملکەچبوون و پێملبوونی ڕەعیەت و خەلکی ڕەش و ڕووت دلنیا بێت و چێژ وەربگرێت لە سەیر و سەیاحەتی خۆی. باسی ئەو سەفەرانەی خۆی نووسیوەتەوە و وەك سەفەرێك بەناوچەی عێراقی عەجەمدا یان سەردانی دەڤەری ناوەندی ئێران. سەفەری ئەو بۆ ناوچەی عێراقی عەجەم ٩٧ ڕۆژی کێشاوە. وێ دەچێت ئەو کتێبە ئاخرین سەفەرنامەیەك بێت کە نووسیویەتی و زۆرتر باسی بارودۆخی جوگرافیایی و دەسەلاتی خۆی و ئەو ناودارانەی لە نێزیك و دوورەوە هاتوونەتە پێشوازی و چاوی پێیان کەوتووە.

ناسرەدین شا، بە ڕێگەی دیاریکراودا بە سواری فەیتوونی پاشایی لەگەل ١٠٠٠٠ کەس و ٢٥٠ کەس لە ژنانی حەرەمخانەدا سالی ١٣٠٩ ك.م. لە دارولخەلافەی عەشرەتاوا وەڕێ دەکەوێت و، ڕێگەی شێخ عەبدولعەزیم دەگرێتە بەر و دەچێتە کەهرێزك. حەسەناوا، قوم، دلیجان، محەللات، سولتاناوا، بروجێرد و دەوروبەری و نەهاوەند، تووسرکان، فەراهان، ئاشتیان و ساوە و روبات کەریم و دواتر دەگەڕێتەوە بۆ تاران.

ژمارەی ئەو ئەسپانەی لەو قەتارەدا بوون، بێجگە لە بەرزەولاخ، نێزیکەی ٤٠٠٠ سەر نووسراوە. ڕێکخەری بەرنامەی سەفەر بۆ شارەکان بەم شێوەیە بووە، لە ڕۆژی یەکەمدا بارخانەی شا گەیشتۆتە شوێنی مەبەست. ڕۆژی دووەم خواجەکانی حەرەمخانەی پاشا لەگەڵ نۆکەرە تێلابەدەستەکان بۆ دوورخستنەوەی خەڵك، لە دەروازەی شار دەچوونە ژووریٚ و بە سەد فەیتوونەوە لە شوێنی دیاریکراو خێوەتیان هەڵدا. سێیەم ڕۆژ پشتمێری شاهانە لەگەڵ چەند هەزار پارێزەر، میرغەزەب بە قەڵافەتێکی ترسێنەرەوە لەشانی چەپ و دەسەڵاتداری ناوچەکە لە دەستە راست و مەزنە میران لەچەند سەد مەتریی خاوەنشکۆ دەهاتنە پێشیٚ و، تەشریفی موبارەکیان دەهاتنە نێو شار. ئەمەش روون و ئاشکرایە ئەم هەزارەزیلەیە روو بکاتە دەریای عومانیش، هەڵی دەلووشێت.

گەلۆ، شای قاجار دوای وەڕیٚ کەوتن لە سوڵتاناوا یان ئەراکی، ئێستە دوای دە ڕۆژ سەیروسەفەر، ڕۆژی شەممە ٢٢ زەیقعدەی ساڵی ١٣٠٩ ك.م. لە ڕێگەی سەرنجە و گوندی زالیان بەرەو بروجێرد دەجووڵێت. لە زالیان کە پێی دەڵیٚ دوایین موڵکی عێراق حەکیمولمەمالیك دەسەڵاتداری عێراق ئیزن دەدات بگەڕێتەوە. لەو دەورەیەدا ئەمیرخانی سەردار فەرمانڕەوای بروجێرد و لوڕستان بووە شەویٚ هۆردوو لە دەوروبەری خومارخان یان سەرنجە خەریکی پشوودان دەبێت، ئەمیرخانی سەردار لە بروجێردەوە دەچێتە خزمەتی شا، لەویٚ ئیزنی گەڕانەوە دەخوازێت تاکو لەشار میوانداری لیٚ بکات. شا حەز دەکات ماوەیەك لە سەرنجە وەمێنیٚ و هەوای سازگاری ئەم ناوچەیە هەڵبمژیٚ و چی دەرد و بەڵایە لە خۆی دوور بخاتەوە. دەڵیٚ قەت هەوای ئاوا لە تاران دەست ناکەوێت.

دوای یەك دووڕۆژ حەسانەوە، هۆردووەکەی شا رووده کاتە بروجێرد. بەشی حەرەمسەرا بەیانی ڕادەگوێزن و خاوەنشکۆ دوای نانی نیوەڕۆ دەگاتە شار. لە مەودای ڕێگەدا هەرچییەك دەبینیٚ لە ئاوەدانی و سەوزەڵانی و باخ و بێستان پێی جوان دەبێت و حەزی پێدەکات. دەنووسیٚ:

"لەولای گردەکەوە دەستەی سواران ریزیان بەستبوو، سوارانی میر و بەگلەران بە جویٚ و، سەردار و خان و قوڵەبەگان هەموو دەستەونەزەر، بەڕێز ئەمینووسوڵتان و سەدری ئەعزەم و...گشتیی لەو شانەوشانی خاوەنشکۆ ئارام دەڕۆیشتن...دەستەیەك لە پێشەوە و چینێك لە دواوە بە ریز دەهاتن. سوارانی بیرانوەندی و سەگوەندی دەڤەری

لوڕستان زۆرینەیان چەکی مارتینیان بە شانەوە بوو، بەڵام کەوای شۆڕیان دەبەردا بوو... لەسەر گردی شاری بروجێرد و سیلاخۆری سەروو...هەموو جێیەك بەدەرەوە بوو...وەختێ لە شار نێزیك بووینەوە، ورد و درشت هاتبوونە پێشوازم لەبەرئەوەی نەیاندەتوانی لە فەیتوونەکەدا ببینن سواری ئەسپ بووم...زیاتر لە ٤٠٠٠٠ کەسم وەبەرچاو هات... ئەمیرخانی سەردار چەند کۆشك و کەژاوەی شاهانەی لەسەر ڕێگە بۆ ڕازاندبوومەوە. ڕووم کردە شانی خۆرئاوای شار بۆ لای باخی ڕەحمەتی محەمەد تەقی میرزای حیساموسەلتەنە کوڕی فەتەلیشا و، لەوێ جێیان بۆ ئامادە کردبووم... خێوەتەکەی منیان لە نێوەڕاستی باخەکە هەڵدابوو... دواتر چوومە سەردانی عەمارەت و هۆدەکاتنی حەرەمخانەم بەسەر کردەوە... ڕۆژی دوایی فەرمانماندا خێوەتی زەڕی مەزنیان برد لەژێر دارچنارەکاندا لە نێزیك دەروازە هەڵیان دا و نانی نیوەڕۆمان لەوێ خوارد. بەڕێز ئەمین سوڵتان و عەزیزسوڵتان مەلیجەك لەوێ بوون.”

ناسرەدین شا، لێرەدا باسی سێ دەستە لە خان و ئاغاوات و مامۆستایانی ئاینی شاری بروجێرد دەکات. باسی زانایانی بروجێرد دەکات و بەوردی ناوی حاجی میرزا هەیبەتوڵڵا کوڕی مەزنی ڕەحمەتی حاجی میرزا مەحموود دەهێنێت. ئەو پیاوە چەند ساڵ پێش سەفەری ناسرەدین شا، بۆ عێراقی عەجەم، لەگەڵ سەفەری (ڤل السگان)، کوڕەمەزنی ناسرەدین شا و دەسەڵاتداری ئیسفەهان و لوڕستان لە نێوشاری بروجێردەوە بە دەهۆڵ و زوڕناوە ناڕەزایی خۆی دەربڕێ، ئەویش لە پەڕەکانی دواتری لە بیرەوەرییەکانیدا دەیخوێنینەوە. لە زانایانی خوڕەماوا، ناوی حاجی ئاغا کوڕی ڕەحمەتی ئاغا سەدرەدین، مەلا ئەحمەدی شێخ سەلام دەهێنێت. دواتر لە یاداشتی ڕۆژانەیدا ئەینووسێت:

“ئەمڕۆکەش لە هۆدەی خۆماندا نەهاتینە دەرێ، چونکە شازادەکاتن و مەزن پیاوانی بروجێرد و سەردارانی لوڕ و بەختیاری دێنە سەردانمان...دوای فراوێن خان و ئاغاکانی لوڕ لەگەڵ توشماڵان هاتنە خزمەتم. لەنێو ئەواندا کوڕێکی جوانچاکی ڕەشید و خاوەن جەماڵ بە ڕدێنێکی درێژەوە هاتبووە دیدەنیم، ناوی سەید مێەدی خان لە وەجاخزادەکاتن بوو. دواتر خانەکانی گودەرزی لە تۆرەمەی کەریم خان، چاویان پێم کەوت. چەندێك بەگەرمی لەگڵیان کەوتمە گف و لفت... چوومە سەیری کانی وەنەوشە...چاوم بە گوندی گۆشە کەوت... سەردانی گوندی زرشکەم کرد، خەڵکی

گوندەکە هۆزێکی جیاوازن، ئەوانە پێك هاتەیەکن لە قەرەج و سنەیی و لوڕ و کورد. جلوبەرگی نامۆیان دەبەردایە و خەریکی ئاژەڵدارین و ماست و ڕۆن بەرهەم دەهێنن..."

ناسرەدین شا، لە درێژەی نووسینەکەیدا ناوی ئەو شازادە و وەزیر و ئەمیر و ئاغا و نۆکەرانە دەهێنێ کە لە بروجێردەوە دانی بەیانی چاوی پێیان کەوتووە، لە سێ لاپەڕەدا یاداشتی کردووە. بۆ نموونە ناوی تەواوی خانەکانی هۆزی لوڕانی هێناوە، سەگوەند، حەسەنوەند کەخولیوەند، پاپی، کاکاوەند، بیرانوەند، سوارەکانی بەختیاری و بروجێرد و گودەرزی و تاجر و بازرگانی ئیسفەهان و کاشان و دزفول و دەستەی چیتکەران. باسی هاتنی سوارانی یارئەحمەدی کردووە بە سەرۆکایەتیی حەیدەرخانی سەرهەنگ کە دواتر پلەی سەرتیپی وەرگرت، یەکێکە لە کوڕەکانی حاج ئەحمەدخانی یارئەحمەدی. زۆریش بەوردی باسی ئەو هۆزە دەکات و بە ناودار و سوارچاك ناویان دەنووسێت:

" ساعەدەولە سەرداری هێزی عێراق، حاجی ئەحمەدخان یارئەحمەدی چالانچولانی پیاوێکی چوارشانە هات و چاوم پێی کەوت. دەبێ لەگەڵ سەد سواری خۆی بچێتە ئەستەراوا...ئیزنی خواست و بەرەو ئەستەراوا کەوتە ڕێ...."

ڕۆژێ دواتر دەچێتە زۆراب و نایی. لەسەر گردەکە، دەشتی سیلاخۆری سەرێ و بە وتەی خۆی سەدان گوند و ئاوایی و شارەدێی ئوشترنیان دەبینێت. ناوی ئەم گوندانە سەرهەنگ لوتف عەلیخان فەرماندەی هێزی سیلاخۆر کە لەخزمەت شادا دەبێت و شارەزای ناوچەکەیە و دوو دانگی گوندی نایی، ەی خۆیەتی، بە پاشای دەڵێت و لە درێژەدا دەنووسێ:

"هاتینە سەر ئاوی نایی... لە تەنیشت رووبارەکە شوێنێکی باشمان هەڵبژارد. ئەمرمان کرد سەیوانێك هەڵ بدەن و نانی نیوەڕۆمان خوارد...ڕێگەیەك لێرەوە دەچێتە خاوە و ئەلشتەری لوڕستان."

شا، بۆ بەیانی دەچێتە کولیدەر. پێش ئەوەی بکەوێتە ڕێ، ئیزن دەدا ئەمین سوڵتانی سەدری ئەعزەم چاوی پێی بکەوێت:

"هاتە خزمەتم، دانیشت و فەرمایشتم فرموو ڕاسپاردەکاتنی خۆم بەگوێدادا... چەند زانایەك روخسەدی چاو پێکەوتنیان وەرگرت، بەڕێز حاجیاغا هاشم لەگەڵ دار و

دەستەکەی، بەڕێز ئاغا سەی باقر پێش نوێژی تازەی شاری خوڕەماوا، وەکازێکی نقێمبەند و بالاپۆشێکمان بەدیاری پێدا...”

هەروەك دەڵێ دوای سەردانی سەراوی کولیدێر و دیتنی دوو چناری ١٣٠٠ ساڵە دەگەڕێتەوە بروجێرد. لە دواڕۆژدا چاوی بە مزگەوتی شا دەکەوێ و دەنووسێ لە دەورەی خاوەنشکۆ فەتەلیشادا بەردی بناخەی داندراوە. بەهۆی ئەوەی پێویستی بە نۆژەنکردنەوە هەبوو فەرمانم دا، هەزار تمەن لە ماڵیات بگێڕنەوە و لێی خەرج بکەن. ئەوەی لە بیرەوەریی دواڕۆژدا ئەنووسێ:

“ئەمڕۆ دەبێ لە شاری بروجێرد بچینییە دەرێ و چاومان بە سەرکانی و نایی بکەوێت... ئەمەش لە نێزیك نەهاوەندە. ئەوەڵی بەیانی .... هەستاین. هاتینە دەرێ، هێزی پشتکۆی لوستان و تەواوی نۆکەر و پێوەند و حوسێن قولی خانی والی (ساروم سەلتەنە) نێزیکەی پێنسەد کەسیان چەکدارن. ئەمیر خانی سەر دار هات بۆ لام. تەواویان ڕەشید و جوامێرن.... زۆرینەیان هۆزن. خزل لە نەهاوەند و دەوروبەر نیشتەجێن و نێزیکەی هەزار خێزان لە پشتکۆی لوڕستانن. دوو پەل لەو سەربازانە خەزەلین و سانی سەربازەکانیشم چاو پێکەوت.”

پاشای قاجار دوای ئەوەی لە بروجێرد دەچێتە دەرێ، چەند شەوێك لە تەنیشت ڕووبارێکی دڵگیر دەمێنێتەوە، ئەم ئاوە لە "نی"یەوە دێتە خوارێ. لێرەوە فەرمان دەدا بە میر شکار و نچیرڤانان لە سپێدەی بەیانیدا بچنە سەر کێوەکان و ڕێگەکان تاقی بکەنەوە بۆ ئەوەی لەسەر ڕێگەی لوڕستان ورچ نەیەتە سەر ڕێگەی خاوەنشکۆ. ئینجا حەز دەکات بچێتە سەر دوندی چیاکە و لە مەحاڵی لوڕستان بڕوانێت. بەڵان سەرۆکی ڕاوچیان دەڵێ ڕێگە ئەمین نییە و ناسرەدین شا، لە نیوەی ڕێدا دەگەڕێتەوە. لەسەر کانی وەنایی باسی عەلی خانی گودەرزی دەکات و بە پیرە مێردێکی ٩٠ ساڵەی تاریف دەکات و پیاوێکی ڕێکوپێك و تۆکمە و زیت و وریا و خاوەنی ریشێکی درێژ و خزمەت کاری پاشایە و بەڵەدی ناوچەکەیە. دوای فراوێن ئیعتمادوسەڵتەنە ڕۆژنامەی (ئوروپ) دەخوێنێتەوە. سبەینێکەی دوای پشوودانێکی تەواو لە سەرکانی سەیری ڕێژەی سوارەکانی یارئەحمەدی دەکات. زۆری پێ خۆش دەبێت. بەبۆنەی هەوا گەرمەکەی

ئەهواز مەشقی سەربازان زوو کۆتایی پێ دێت. لە کۆتاییدا دوای ١٨ ڕۆژ مانەوە لە بروجێرد و دەوروبەر، ناوچەکە بەجێ دەهێڵێ و دەچێتە نەهاوەند.



دکتۆر فووریە پزیشکی تایبەتی ناسرەدین شا، لە سەفەری خاوەنشکۆدا بۆ عێراقی عەجەم، هەروەك لە سەرەوە باسمان کرد، لەگەڵ هۆردووەکە بووە. ئەویش لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا بەناوی (سێ ساڵ لە دەرباری ئێران دا) دەینووسێتەوە.

پێویستە پوختەیەك لەمەڕ هاتنی فووریە بۆ دەرباری ئێران بخەینە روو، لەبەرئەوەی ناوبراو لەنێزیکەوە لەگەڵ شای قاجار دا بووە و ئاگەداری هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی ناسرەدین شا بووە. ئەوەی ئەو دیتوویەتی هیچ غەوارەیەك نەیتوانیوە ببینێ و پێی بزانێ. شا، لە باسی سەفەری خۆی بۆ فەرەنگ و مانەوەی لە پاریس بەم شێوەیە دەنووسێ:

"ئەمرۆ حەکیم باشی تولوزان دکتۆرێکی بۆ هێنام بەناوی فووریە... فووریە بەجلوبەرگی سەربازییەوە هاتۆتە پاریس، دیارە پیاوێکی عەسکەرییە، جەحێڵێکی جوانچاك و پتەوە و زۆر وریایە. بەهۆی ئەوەی تولوزان گەرەکیەتی چەند مانگێك لە پاریس بمێنێتەوە، لە جیاتی خۆی ئەم پزیشکەی هێناوە لە خزمەتمدا بێت."

فووریە لەگەڵ هۆردوی ناسرەدین شا، دەچێتە بروجێرد. لەو بارەیەوە دەنووسێ: بروجێرد شارێکی مەزنە و ٢٠٠٠٠ کەسی تێدایە، بەڵام تا بڵێی پیس و پۆخڵە. کاتێك لە دەروازەی شارەوە دەچێتە ژووری تەنیا کەلاوەکۆن و پیسایی سەرنجت ڕادەکێشێت. کووچە و کۆڵانی تەنگەبەر و بازاڕی ناخۆش و تاریکە. تەنیا شتێك هەیە نەخۆشی و دەرد بەڵای ئەو شارە بکوژێت ئەویش تیشکی هەتاوە. دواتر دەنووسێ:

"شوێنی دانیشتنی ئێمە دوو هەنگاوێك لەو لاوەی لوڕستان، ناوەندی هۆزەکانی لوڕ و بەختیارییە، گەزنەفون ناوی ناوە باکترین. ئەم شوێنە نیشتمانی سوارانی جوامێر و سەربزێو و لاسارە. پادشای وڵات زۆر بەزەحمەت دەتوانێماڵیاتی ئەم دەڤەرە بستێنێ. ئەم هۆزە بە پێچەوانەی دارکەرانی مازندەرانی کە پاشماوەی ئەشکانیانن. کورتەباڵا و ڕیشیان تەنکە، ئەمانە کەڵەگەت و سەروکەڵلەزل و ڕدێنیان درێژ و رێکە، بەڵام هیچ

وەختێلەهەمبەردەسەڵاتی دەوڵتدا سەرنەوی ناکەن. ئێستەش فەرمانڕەوای لوڕستان لە بروجێرد دادەنیشێ... لوڕ و بەختیارییەکان لە کوێستانەکاندا دەژین و تێکەڵ بە دەشتیان نابن. هەرچەندە بروجێرد لەگەڵ خەڵکی لوڕستان جێرانن قەت حەز بەخزمایەتیی ئەوان ناکەن."

سەبارەت بە زمانی بروجێردیان دەنووسێ: شاعیرێك لەمەڕ مافی خەڵکی ئەم شارەوە دەڵێ " ...دەشێ چرووکی خەڵکی بروجێرد بەزمان پاراوی ئەوان ببەخشی." پزشکی پاشای قاجاری لە قەولی خەڵکەوە دەبێژێت، ڕەنگە ئەم سەفەرە ژیرانەی شا بۆ ناوچەی لوڕستان لەبەرئەوە بێت دڵی لوڕەکان بەدەست بێنێ، هێوریان بکاتەوە لە دەست غەدرەکانی زەللەسوڵتانی کوڕی دەسەڵاتداری ئەوسای باشوور و خۆرئاوای ئێرانی وێران کرد.

فووریە دەگێڕیتەوە لە ماوەی ئەو حەوتەیەدا کە شا لە شاری بروجێرد بوو، هەمووڕۆژێ دەستەیەك لە خان و ئاغاکانی لوڕی دیت و لەگەڵیان دانیشتووە. بە یەك یەکی ئەو کەسایەتیانە باڵاپۆشێك دەبەخشێ و ئەوانیش بەم دیارییە شاهانەیە زۆر دڵخۆش دەبن و شانازی دەکەن. نووسیویەتی باشترین شتێك کە لوڕستانی دایدەچێنن خەشخاشە.

لە کۆتاییدا ئەویش هەروەك شا، وەختێ لە بروجێرد دەچێتە دەرێ، سەردانی نەهاوەند و سەرکانی و گاماسی و دەوروبەردەکات و لە تاریفیان ڕادەچێت، بەڵام هەر لەو کاتەشدا دەنووسێ، بەهۆی نێزیکی لوڕستان تووشی زەحمەتێکی زۆر بووە و دزی کراوە و تەنانەت دزان دەست دەگەیەننە خێوەتی خاوەنشکۆش!

* * *

ئێستەش کاتی ئەوە هاتووە چاوێك بخشێنین بە مێژووی مەسعودیدا، مەسعود میرزا ڤل السلگان کوڕە مەزنی ناسرەدین شا، بابزانین چۆناوچۆن لوڕەکانی ڕەنجاندووە بەم چەشنە فووریە دەڵێ بابی هاتبوو دڵداری لوڕان بداتەوە. لە بەرایی دەبێ بڵێین لەبەرئەوەی دایکی شازادە لە تۆرەمەی قاجارەکان نەبووە زەللەسوڵتان بە جێنشینی هەڵینابژێرن. ماوەی ٣٥ ساڵ دەسەڵاتی ئیسفەهانی بەدەستەوە دەبێ و لەوێوە

کۆمەڵەکەسێکی لەبری خۆی ڕەوانەی ئەو شارانە دەکرد کە لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا بوون. تا بڵێی لاسار و چەتە و ناڕەسەن بوو. لەچاو شازادەکانی دەورەی خۆی هەروەك حەزیا وا بوو. ئەوانەی خۆشیان نەدەویست ناویان نابوو زەلزەلەسوڵتان. دایمە حەزی لە ڕاو و شکار بووە. ئەسپاروی خەڵکی ئینگلستان ماوەیەك مامۆستای منداڵەکانی زللەسوڵتان بووە، لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا بەناوی منداڵانی دەربار، باسی شازادەکانی کردووە. زەللەسوڵتان کتێبێکی لە سەر ژیانی خۆی نووسیوە بە ناوی مێژووی مەسعوودی، ئەمەش پەڕتووکێکی باشە. هەر لەو کتێبەدا باسی سەفەرەکەی خۆی کردووە کە چۆتە لوڕستان.

زللەسوڵتان لەو کاتەدا کە دەسەڵاتی دەبێ و گا بە دەنگی دەڕوات، لەسەرەوە بە ناوی سەیران و نیچیرڤانی و لە بنەوەش بۆ نواندنی هێزی دەسەڵاتی خۆی و ئەو لەشکرە سەربازیەی لە ئیسفەهان لەبەر دەستیدا بووە، بەکەیفی دڵی خۆی جووڵاوەتەوە و هەروەك خۆی دەڵێ، سەفەری کردووە بۆ خاکی عێراقی عەجەم و چۆتە بروجێرد و ماوەیەك گیرساوەتەوە و لەمەر ئەم سەفەرەوە دەنووسێ:

"لە عێراقەوە بەرەو بروجێرد کەوتینە ڕێ، عەلی نەقی خانی کەزازی ئەمیر تومان خاوەن موڵك کە ناوچەیەکی پان و بەرینی بەدەستەوەیە میوانداریی لێکردین....زۆر باش قەدری گرتین و دواتر سەردانی بروجێردمان کرد" شاری سەوزی حەزرەتی سولێمان کە بەشێکە لە ئەفسانەکان هەر ئەو بروجێردەیە. جێی خۆیەتی بێژین زۆریش لە شاری شیراز دەچێت...شار کەوتۆتە نێوان دەشت و کەژ و کۆسارێکی دڵگیرەوە، وێنەی نییە و باخاتی جوانی بەناوبانگە بە تەکیە و، لەو نێوەدا خەریکی سازکردنی باڵەخانە و کۆشك و بورج و تەلارن. ئەمەش لەترسی دزانی لوڕە."

دەنووسێ دانیشتووانی بروجێرد نێزیکەی ٥٠ هەزار کەس دەبن و بەشێکن لە لوڕی مەزن یان فەیلی. دەسەڵاتی بروجێرد چەند ساڵێك لەژێر دەستی محەمەدتەقی میرزا ناسراو بە حیسامولسەڵتەنە حەوتەم کوڕی فەتەلی شادا بووە. بە وتەی زەللەسوڵتان باخە بەناوبانگەکە، واتە باخی شا و مزگەوتی شا، هەرئەو حیسامولسەڵتەنەیە سازی کردوون و دژ و قەڵایەکی باشی لە دەوری بروجێرد بنیات ناوەوە. سوڵتان باسی دەسەڵاتی سەی حاجی میرزا مەحموود دەکات، زۆر جار زەبری باشی لە دەسەڵاتدارانی

دەوڵەتی وەشاندووە. حکوومەتیش چەند جارێك دەستی گرتووە بەسەر ماڵك ماڵی جەنابیدا، ئەویش بۆ سەندنەوەی هەستاوە چۆتە تاران. بەساڵ لەوێ ڕایان گرتووە" بەڵام دواتر ئازادییان کردووە و لە ناوچەی سۆفیا لە شوێنێك بەناوی "بەست" گیرساوەتەوە.

مەسعوود میرزا زەللەسوڵتان کاتێ لە لەگەڵ هۆردووەکەی لە لە بروجێرد دەبێت، ناسرەدین شای بابی بە دیاری شمشێرێکی بۆ دەنێرێ. بە پێی نەریت و دەستوور دەبوو، بچێتە پێشوازیی دیاری شاهانە، مەجبوور بووە بەنێو شار و بە سۆفیاندا دیارییەکە بێنن، تا لەنێو بروجێردەوە پێش وازی بکرێت ئەو میوانانەی لە تارانەوە هاتوون. لەو کاتەدا ئیحتوشام لسەڵتەنە نایبوحکوومەی بروجێرد دەچێتە خزمەت زەللەسوڵتان ودەڵێ: جەنابی حاجی میرزامەحموود ڕازی نییە بە دەنگی دەۆڵ و شەیپوورەوە بە سۆفیاندا بێن و ئەم کارە بە بێ ئەدەبیکردن دەەەمبەر شەرع دەزانێ، هەڕەشەی کردووە کفن دەبەر دەکەن و لەگەڵ سەیدەکان بەدژی دەسەڵات هەڵدەستن و پێش بە سەربازانی دەوڵەتی دەگرن. هەر وەك زەللەسوڵتان نووسیویەتی، گوێ بەو هەڕەشەیە نادات و، دەڵێ تەواوی سۆفیان و دەوروبەری بە تۆپباران کاول دەکەم. وەجاخزادەکاتن لەو هەڕەشەیە دەترسێن و، هێزی سوڵتان بە دەهۆڵی شەڕ و تەدارەك و موبارەکی خۆیانەوە رادەبرن، تەنانەت دەنووسێ: ماوەیەکیش لە ماڵی سەید دەمێننەوە. دوای ئەوەی دیارییەکە وەردەگرن دەگەڕێنەوە بۆ هۆردووی خۆیان و لە درێژەدا دەنووسێ:

"لێرە کاتێك لە بروجێرد بووین هەواڵی شەڕوشۆر و ئاژاوەگێڕیی دانیشتووانی لوڕستان بە سەرکردایەتیی ئەسەد خانی بیرانوەندی و سەردارخانی سەگوەند و یاخیبوونی ئەو دوو هۆزەمان پێگەیشت، بە ڕوواڵەت گوێم نەدایە، بەڵام لە ناخەوە زۆری پێ تێك چووم..."

زەللەسوڵتان لەوماوەدا لە بروجێرد دەبێ، بەبیانووی سەیر و سەیاحەت و ڕاوکردن دەچێتە ونایی و دەوروبەری بروجێرد و زۆریش لە پەسنی جوانیی ناوچەکە ڕادەچێت. هەروەك دەنووسێ، نێزیکەی ٦٠٠٠ کەس لە کێوەکان بەشێوەی بازنەیی دەوری نێچیریان بۆ گرتم بۆ ئەوەی خەریکی ڕاوکردن بم. چوار شەو لە ونایی دەمێنێتەوە و لەو ماوەیەدا میوانی سەرهەنگی تۆپخانە رۆستەم خان و سەرهەنگ لوتفالی خان فەرماندەی هێزی لەشکری دەبێت، بەوتەی زەللەسوڵتان "...ئەوانە زەنگین و

سامانداران‌ی بروجێرد بوون، بەکەیفی خۆیان بۆ سوڵتانیان خەرج دەکرد، ئێمەش بە ۳۰۰۰ نانخۆرەوە میوانی ئەو دوو سەرهەنگە چارەڕەشە بووین. دەستمان برد و بۆ هەر یەك لەو سەردارانە پارچە کوتاڵ و قوماشێکمان پێ بەخشین." کەس گەلێك لە لوڕستانەوە بۆ چاوپێکەوتنی دێنە بروجێرد و سەرەتا باسی مامۆستا و پێشنوێژی لوڕستان دەکات و دەنووسێ:

"ئەو خوێندەواریەکی وای نەبوو. شەریکی و دز و هاوڕێیی کاروان بوو. چ ڕاست و چ درۆ هەردەبوو وا بێت. چار نەبوو هەر دەبوو لەگەڵ دەسەڵاتدارانی لوڕستان و ئاغا خوێنمژەکان بەم چەشنە وەجووڵێ....هەر کە هاتە ژووری زانیم بۆچی هاتووە، بەڵام لە دڵەوە سوپاسی خوام کرد و ئەم دیدارەم لەگەڵ ئەو پێشنوێژە بە فەرامۆشییەك و خۆشنوودییەك زانی و لەبەر خۆمەوە ئەو شیعرەم خوێندەوە:

تۆ هێندە زیت و وریایت/ ناگەم بە تۆزی ڕێگەت"

دوای ئەوانە سەبارەت بە نایبوحکوومەی ئەوێ بە ناوی حاجی موحسێن پرسیار لە پێشنوێژی میوانی دەکات. پێشتر خزمەت کاری شازادە بووە. ئەوجار بەر دەوام باسی دەسەڵاتی خۆی بۆسەید دەکات، کە سوارانی بەختیاری پشتیوانی لە دەوڵەت دەکەن. هەروەك لە نووسراوەی خۆیدا دەردەکەوێ بەسەید دەڵێ بەدەستێك شمشێر و بەدەستێك کیسەی ئاڵتوونی پێیە و هاتۆتە لوڕستان. دەزانێ ئەو پێشنوێژە سیخوڕی خانەکانە بە تەوس و تانووت دەیدوێنێ، لەو بارەیەوە دەنووسێ:

"... هاوڕێیانی ئەو ئیمامەی لوڕستان میرزا ڕەشیدخان و وەزیر و چەند کەسێکی ئاقڵمەند و حوسێن قولی خانی والیی پشتکۆ، ۵۰۰۰ تمەن پووڵی نەغد، چوار قەتار هێستر و شەش سەر ئەسپی ڕەسەن، ئەوانەیان بە دیاری بۆ هێنابووم. والی بە بیانووی نەخۆشییەوە داوای بەخشینی کردبوو ناتوانێ بێتە نێو هۆردووەکە. تەنیا ئەسپێکی کرێندیم پەسند کرد...وتم من وەك زۆر یەك لە فەرمانڕەوایان نەهاتووم ئێوە بڕووتێنمەوە و پارەتان لێ بستێنم. دوای خودا و حورمەتی بابی خاوەنشکۆم هەموو شتێکم هەیە. هاتووم بزانم گوزەرانی ئەو خەڵکە چۆنە، لە ماڵی خۆم هەزار وشتر و شەشسەد هێسترم هەیە و چاوم لە چوار هێستری تۆی بەڕێز نییە. ناتوانێ بێتە دیدەنمان

بانەیا، دەزانم پیرەمێردە، بەڵام بیستوومە پشتکۆ جێ ڕاوگەیەکی زۆر باشە، من دەچمە سەردانی ئەو...بە سەد هەزار سەربازەوە دەبمە میوانی."

میرزا ڕەشیدخان راسپاردەی والی پشتکۆ مرۆڤێکی جوامێر و سەردەرهاتوو بووە، داوا لە زەللەسوڵتان دەکات بەخەتی خۆی نووسراوێك بۆ والی بنێرێ تا بێت سەردانی بەکات، بەڵام شازادەی قاجار خۆی لە قوئان مۆر کردن و ئەماننامە بخشین گێل دەکات و هەروەك دەڵێ خۆی بە لەشکر و هۆردووە کەی دەنوێنێ و بە سەرۆکی دز و چەتان دەڵێ: ئەهامن خاوەنی ئەو هەموو هێزەم.

ئەوانەی لەگەڵ زەللەسوڵتان بوون، باش شارەزای ناوچەی لوڕستان و ڕێگە سەختەکان بوون و باسی هۆزی بیرانوەند و سەگوەندیان بۆ کردبوو هەروەك سوڵتان نووسیویەتی و، دەڵێ: " بەخۆت و ئەو چەند سەربازەی لە ئیسفەهانەوە هێناوەتە بەرگەی هەڵمەتێکی لوڕان ناگرن و ئەو چوار لوولە ئاسنەی ناوتان ناوە تۆپی ئوتریشی، لاساری مەکە و واز بێنە..."داوای لێ دەکەن دەست بە قورئاندا بدات، بگرە خانەکان دڵنیا بن و بێن بۆ لای، بەڵام زەللەسوڵتان قسەی ئاقڵمەندانی دەوروبەری خۆی دەگوێ ناگرێ و دەڵێ ئێوە ترسنۆکن.

زەللەسوڵتان ماوەیەك دواتر بروجێرد بەجێ دەهێڵێ و بەرەو خوڕەماوا دەڕوات تاکو دوای ڕاسپاردەکاتنی خۆی سەردانی خوزستان بکات و فەرمان بدات، ناوچەکە بەرەو باشی بەرن. وەختێ دەگاتە کەلی رازان، هێزێکی هەزار کەسی لە چەکدارەکانی بە دوو عەڕابە تۆپەوە لە پشت خۆیەوە دادەمەزرێنێ بۆ ئەوەی لە هێرشی لوڕان دڵنیا بێت و گەمارۆی نەدەن. ئەوسا بە هۆردوویەکی ٣٠٠٠٠ چەکدارەوە ڕێگەی خۆی دەگرێتەبەر.

لە نووسراوەکەی شازادەی قەجەرڕا وادەر دەکەوێ پێشنوێژەکە و میرزا ڕەشیدخان ڕاسپاردەی والی، کە پێشتر هاتبوونە بروجێرد، وەختێ دەگەڕێنەوە لوڕستان ئەوەی دەبینن و دەیبیستن لە نووکەوە بۆ خانەکانی دەگێڕنەوە. ئەمجار لوڕان لە کردە و گوفتاری شەڕانخێویی خۆیان پەژیوان دەبنەوە و هەرهەموویان دەچنە خزمەت حاجی موحسێن نایبوحکوومەی خوڕەماوا، ئەو دەکەنە پردی نێوان خۆیان. خان و بەگلەران نێزیکەی ٢٠٠٠ سوار لەگەڵ نایبوحکوومە دەچنە پێشوازی ئۆردی زەللەسوڵتان و لەو ڕفتارەی هەبوویانە عوزرمایی دەخوازنەوە. سوڵتان دەنووسێ بێ هەمیەتی و دلۆڤانی من وای کرد خانەکان لەو فکر و خەیاڵەی لە سەریاندایە دوور بکەونەوە و دواتر دەنووسێ:

“سەرۆکی ئەوان حاجی عەلی سەگوەند پیاوێکی وریا و توندوتۆڵ بوو. لەگەڵ ئەسەد خانی بیرانوەند و مێەرعەلی خانی برای... زۆریەك لە ئاغاواتی لوڕستان، باقر خانی ئەمرایان لەگەڵ هاتبوو. گوتم بچنەوە دەڤەری خۆتان و خەڵکێکی زۆر لە ناوچەکە کۆبکەنەوە شایانی خزمەت کردن بن، حەزدەکەم بچمە ڕاوی مامز و ورچ و کەو و کوڕکوڕ و بڕڕەکان. دوای پشوودانێك خوڕەماوا و لوڕستان بەسەر بکەمەوە و سەردانی عەرەبستان و خوزستان بکەم و لە ڕێگەی پشتکۆ وە بچمە ماڵی والی...لوڕستانم قبووڵ نەکرد مەگەر بۆ ڕاوکردنەکە دوو مانگ وەمێنم. دۆست و دوژمنی خۆم بناسم. چ بکەم.”

زەللەسوڵتان لێرەدا بەکورتی باسی ناوچەی پڕ پیتی لوستان دەکات، پێی وایە ئەم ناوچەیە زۆر لە شیراز پڕ داهاتترە و خاکی باشترە. ئەو دەڵێ زۆرینەی مێژوونووسان لوڕستان بەسەر دووبەشدا جویْ دەکەنەوە، سەرەتا لوڕی بچووك، کە ئەمەش برێتییە لە کۆەکیلۆیەی فارس و مەمەسەنی و بەختیاری و بەشێك لە خوزستان” دووەمین لوڕی مەزن هەروەك دەنووسیْ تەواوی **محاڵی** بروجێرد لەسەر ئەوە و زۆرینەی مێژوونووسان نووسیویانە، مەلایر و توویسرکان و نەهاوەند و خەزەڵ و پشتکۆ کە برێتییە لە خوڕەماوا هەروەها پشتکۆ بەشی فەیلییە و نێزیك دەبێتەوە لە کرماشان، بە لوڕی مەزن ناویان بردووە. دیسا بەم چەشنە دەنووسیْ:

“هێرشی مەغوول و تاتار و عەرەب بۆسەر خاکی ئێران، کارێکی کرد ئێرانی ڕەسەن و زەردەشتیان لەنێو بچن، یان لەژێر تەوژمی ئەم سیْ هۆزەدا بتوێنەوە. تەنیا لوڕی بچووك و لوڕی مەزن و کوردستانی عوسمانی و کوردستانی ئێران، ڕەگەز و کولتوور و نەریتی خۆیان پاراستووە و پاشماوەی ساسانی و پیشدادیان و خۆولاتین. لە کەوناراوە ڕەچەڵەکی ئەوانە گۆڕانکاریی بەسەردا نەهاتووە، تەنانەت زمانی لوڕی کە بەشێکە لە زمانی پهەلەوی زۆر بە پاك و بەخاوێنی پارێزراوە و ماوەتەوە.”

کورتە باسێك لە حەبیبولسیەر خوندەمیر دەگێڕێتەوە: “لە کۆندا سەد ماڵێك لە بەشی موسڵ و شاماتەوە دێتە لوڕستان. عەلی کوڕی سەرۆکی ئەم سەد ماڵە لەگەڵ چەند کەس لە تایەفەی خۆی میوانی لوڕی مەزن دەبن. خزمەتکاران لە کاتی نان داناندا، ئەو مەجوعمەی سەری گایەکی لەسەر دەبیْ، بە هەڵە لەبەر دەمی عەلی دایدەنێت. ئەویش بە هاوڕێکانی خۆی دەڵێ زۆری پێناچیْ دەبین بە سەرۆکی ئەم لوڕانە،

هەر کەس شایانی سەرۆکایەتی بێت ئەو خواردنەی بۆ دائەنێن. لەسەر ئەو قسەیە میوان و خانەخۆی قسەیان لێکدی هەڵدەبەزێتەوە. ڕۆژێك لوڕەکان لە چۆڵگەیەك عەلی دەگرن و نیوە مردووی دەکەن و بەجێی دەهێڵن، سەگەکەی عەلی لە دەرفەتێکدا کە لوڕان خەویان لێ دەکەوێ، ئەوکی کابرای دەستوەشێن دەگرێ و دەیخنکێنێت و ڕادەکاتەوە بۆ خێوەتی خاوەنەکەی، خزمانی عەلی وەختێ گۆڵە لمۆز خوێناوییەکەی دەبینن، هەست دەکەن شتێك قەوماوە، دەوکەونە شوێن سەگی یانیگر و دەیان باتە سەر جەندەکی عەلی نیوەگیان. ئەویش دوای ئەوەی برینانی گۆشتە زوون دێنێ و خۆی دەگرێتەوە، لە دوای شەڕی پەیتا پەیتا و لە هەلێکی باشدا ئاخری دەبێتە دەسەڵاتداری تەواوی ناوچەی لوڕستان. پێش بینییەکەی وەك دەڵێ بەڕاست دەگەڕێ. زەللەسوڵتان باسی ئاسەواری مەزنی شارەکانی خاوە و ئەلەشتەر و سەمیرە و جاوە دەکات. ساڵ نییە فەرەنگیان دەست نەکەن بە هەڵدانەوەی کۆنەقەبرەکان و ئەنتیکە جات دەرنەهێن و نەیبەنەوە. دەڵێ شاری خوڕەماوا لە کۆتایی شارۆچکەیەکدایە و بینا کۆنەکانی بەرەو کاولبوون دەڕۆن. بەڕێزیان ٢٠٠٠٠ تمەنی داوە بۆ نۆژەنکردنەوە. لێرەدا باسی خۆشی و باسەفایی ناوچەکە دەکات و نووسیویەتی:

"ئەو بەشەی وا ئەمڕۆ خەڵکی ئەورووپا خزمەتی لادێ شۆرەکاتەکانی خۆیانی پێ دەکەن، دەتوانم بە دڵنیاییەوە سوێند بخۆم ئەگەر بەو خاکی لوڕستانەی بکەن، داهاتی لوڕستان دوو چەندان دەبێ و، جوانی و دڵگیرییەکەی سەد هێندەی سویسرایە. ئەو گشتە ئەندازیارە بەم هەموو خەرجەوە بۆ جوانیی ئەوێندەرێ تێ دەکۆشن، ئێرەش دەستی سروشت و پەنجەی قودرەت جوانیی پێ بەخشیوە...مرۆڤ تا بە چاوی خۆی نەیبینێت باوەڕ ناکات."

سەبارەت بە هۆز و تایەفەکان چەند زانیاریی هاوردووە" لە پێشدا ناوی بەرەبابی فەیلی دەهێنێ کە سەد و پەنجا هەزار بنەماڵەن بە سەرۆکایەتیی حوسێن قولی خانی ئەبوقەدارە. بەهۆی زەبروزەنگی لە ڕادە بەدەری باب و باپیری حوسێن قولی خانەوە تەواویان هەڵاتوون و چوونەتە خاکی عێراقی عارەبان، ئەوانە کەم بوونەتەوە و بوونەتە سی هەزار بنەماڵە. دواتر باسی بەربابی درانوەند یان بیرانوەند دەکات و دەڵێ ئەوانە چل هەزار بنەماڵەن" هەر بەم جۆرەش باسی تایەفەی ئەمرایی دەکات. دەهەزار ماڵیش

بۆ سەگوەندان دەنووسیٚ. تایەفەکانی حەسەنوەند و زنجیرەی دلفان ناودەبات. بەرەبابی مەزن و بچووکی لوڕستان بەگشتی دووسەد هەزار بنەماڵە دەنووسێت. بەهۆی ئەوەی ئەو ژمارەیە لوڕان ئەیدەنیٚ، زۆر لەوە ناچێت تەواو بیٚ. لە مەڕ ڕاوکردنەکەیەوە پێداهەڵدانێك دەکات و دەڵیٚ کەڵەکیوییەك دەکوژیٚ و شاخەکانی لەسەر باڵەخانەی خۆی لە تاران، بەناوی باڵەخانەیی مەسعودیە دادەبەستیٚ. نووسیویەتی کاتێك مەشرووتەخوازان باڵەخانەکەی لە تاران دەسووتێنن، ئەوەندەی بۆ شاخەکان بە پەرۆش دەبیٚ ئەوەندە بۆ ماڵ و کەلوپەلەکەی خەفەتی نەخواردووە...هەر لە کاتی ڕاوکردنی لوڕستاندا باسی ڕیش چەرموویەکی حەسەنوەند دەکات کە تاریفی کردووە، پێی دەڵیٚ تۆ ئاوا چوست و چالاکی چۆنە دایك و بابت دڵیان دەحەسێتەوە لێیان دوور بی؟

کاتێك زەللەسوڵتان لە لوڕستان دەمێنێتەوە، هەواڵی شۆڕشی کوردەکان لە سنووری ئێران دەبیستیٚ و دەنگۆیی کوژرانی شا و شازادە و تالانکرانی ئازەربایجان و تاران بلاو دەبێتەوە. لە خاوەنشکۆوە تەلگراف دەگاتە زەللەسوڵتان و ئەم دەنگۆیە پشتڕاست دەکاتەوە و شا داوای لیٚ دەکات سەفەری خوزستان پەك بخات و بگەڕێتەوە بروجێرد و بچێتە هەمەدان و لەویٚ چاوەڕێی فەرمان بێت.

لوڕەکان بە بیستنی شۆڕشی کوردان وەخۆ دەکەون" دەستەوبەجیٚ هێڵی تەلەگراف هەڵدەبڕن و شاری خوڕەماوا بە بۆنەی زەللەسوڵتان و هۆردووەکەیەوە گەمارۆ ئەدریٚ. گەیشتنی ڕاسپاردەیەك لە مەراغەوە بۆ خوڕەماوا کارە کە لە شازادە تێك دەدات. چونکە قاسیدەکە نامەیەکی زۆر لە مەراغەوە بۆ سەربازەکان دەهێنیٚ، هێزی سەربازیی مەراغە ئەوسا لە پادگانی خوڕەماوا نیشتەجیٚ دەبێت. کەس و کاری ئەوان باسی هێرشی کوردان دەکەن بۆ سەر ئازەربایجان و ورمیٚ و دەست دەکەن بە تالان و بڕۆی خەڵکەکە. سەربازانی مەراغەیی دەرگەی سەربازخانە دادەخەن و هاواری یاعەلی یاعەلی بەرز دەبێتەوە. زەللەسوڵتان بە دەهۆ هۆردوویی خۆی لە خوڕەماوا دەهێنێتە دەریٚ و لە دەرەوەی شار لەسەر گردێك ئامادەباش دەبن. سیٚ پەل لە سەربازەکانی خۆی هەڵدەگریٚ و هێزی سەربازی مەراغە تالان دەکات. تەماشا دەکات سەربازە ئازەرییەکان هاوار دەکەن شێخ عوبێدی کوردستانی شای کوشتوە، تازە شازادەیەك لە گۆڕیٚ نییە و کوردەکاتن ژن و منداڵ و کەس و کاری ئێمەیان هەڵپاچ داپاچ کردووە و، دار و نەداری

ئێمەیان لەگەڵ خۆ بردووە. زەللەسوڵتان زۆر هەوڵ دەدات رازیان بکات ئەم دەنگۆیە درۆیە و ئەوەی بیستوویانە وا نییە، بەڵام سەربازانی مەراغەیی قبووڵی ناکەن و پێمل نابن. بەبێ یەك و دوو لێکردن فەرمان دەدا بەوهێزەی لەگەڵیەتی بەسەریاندا بدەن. هەر وەك خۆی دەڵێ دەپازدەی لاساریان دەکوژرێ و نێزیکەی ٥٠٠ کەسیان بە قۆڵبەستکراوی دەهێننەوە بۆ نێو هۆردووەکەی خۆی.

لە گەڕانەوەدا بە گفتی خۆی لوڕان ڕوویان دەکرێتەوە و تایەفەی بیرانوەند و سەگوەند وەخۆ کەوتوون و هۆردووەکەیان گەمارۆ داوە. نووسیویەتی لە چاوتروکانێکدا نێزیکەی چل کەس لە خان و بەگلەری لوڕان بە بارمتە دەگرێ و، بە تۆپخانەوە روو بەڕوویان دەبێتەوە، لە درێژەدا دەنووسێ:

"ئەوان بەخەیاڵی خۆیان بە ورەیەکی بەرزەوە هاتنە پێشێ. هێزی ئەو تایەفەیە سی چل هەزار پیاو بوون و دە هەزار چەکدار. گرمە لە تۆپ هەستا و بە بڕشتی سەد و پەنجا خومپارە و نارنجەك لەنێویاندا تەقیەوە. تفەنگی سەرپڕی ئەوان تەنیا چل شەقاو دەڕۆیشت. چەکی رەنێلی ئێمە لە سێ هەزار مەتریەوە دوژمنی دەکوشت، چەکدارێکی بۆ ئەوان نەهێشتەوە... هاتینەوە بنکەی خۆمان، ئەسەدخان سەرۆکی بیرانوەندان، سەردارخان سەرۆکی سەگوەندان، خانجان سەرۆکی سەگوەندان، سەفەرخان سەرۆکی سەگوەندان و عەجەم خان سەرۆکی حەسەنوەندان بە بەر چاوی خانەکانی لوڕ و دیلەکانەوە فەرمانم دا لەدار دران، ئەوانەی دیکەش هەروەك مێەرعەلی خان برای ئەسەد خان، کوڕە مامی سەردارخان، حاجی عەلی خان لەگەڵ مێەر عەلی خانی کوڕی، ئەوانە کە سندم کرابوون، ئازادم کردن و گوتم بڕۆنەوە بۆ نێو خێڵ و هۆزی خۆتان، ئەگەر دەست لەسەر بزێوی و لاساری هەڵنەگرن بە زینوویی چاوتان دەردەهێنم و سەرتان هەڵدەکەنم."

لەو نێوەدا حاجی موحسێن خان نایبوحکوومەی خوڕەماوا لەگەڵ دەستەیەك دەچێتە نێو عەشیرەتەکە و دڵداریان دەداتەوە و پێیان دەڵێ هیوایان بە دوارۆژ بێت و گەش بین بن. هەر ئەو وەختە حوسێن قولی خان والی لە پشتکۆوە دێتە خزمەت شازادەی قاجار و شنەی لوتفی خاوەنشکۆی بەردەکەوێ و شمشێری جەواهێر نیشانی بە خەڵات پێدەدەن و دەگەڕێتەوە.

زەللەسولّتان نازناوی مزەفەرومولك بە حاجی موحسێن خان دەبەخشیّ و دەیکاتە فەرمانڕەوای ناوچەی بەختیاری و لوڕستان بەگشتی و، شمشێری نقێمکار و بالاّپۆشی تورەمەی پیّ دەبەخشیّ. لێرەوە ئەمری ناسرەدین شای بابی بەجیّ دەهێنیّ و بۆ ئەو تەلەگرافەی بۆی هاتووە دەچێتە بروجێرد، تاکو لەوێوە خۆی بگەیەنێتە هەمەدان. وەختیّ دەگاتە ڕازان هەوالّی پیّ دەدەن کاتێك ئەو لە خوڕەماوا سەرقالّی شەڕ بووە، نێزیکەی پێنج هەزار لوڕ دەکەونە ڕیّ بچن بروجێرد تالاّن بکەن، بەلاّم لەشکری سیلاخۆر لە ڕازان، توانیویەتی بە یارمەتیی تۆپی ئوتریشی و چەك و چۆلّی ڕەندول زۆریان لیّ بکوژن و لەو دەوروبەرە بیان تارێنن" شار لەدەست لوڕانی دز بپارێزێن.

کاتێك زەللەسولّتان دەگاتە بروجێرد تەلەگرافێکی پێدەگات کە جێنشینی خاوەنشکۆ، مزەفەرەدین میرزا، شۆڕشی کوردستانی لە ئازەربایجان سەرکوت کردووە و، پێویستیمان بە هێزی سەربازیی ئەو نییە. باشە لە بروجێردەوە بچێتە ئیسفەهان. دوای ئەم هەوالّە خاکی لوڕستان جیّ دێلّیّ و، دەگەڕێتەوە بۆ بنکەی فەرمانڕەوایی خۆی واتە ئیسفەهان.



حاجی سەیاحی محەلاتی، دەبیّ وەك گەشتیارێکی خامەڕەنگینی ئەوسای ئێرانی لەقەلّەم بدەین. بە گفتی خۆی سەیر و سەفەرێکی باشی بە چوارقوڕنەی دنیادا کردووە. لە ئەورووپاوە بۆ ئەمەریکا و لەوێشەوە چۆتە ژاپۆن و چین و سەردانی بەمبەیی کردووە و لە هێند چاوی کەوتووە بە ئاغاخانی محەلاتی هاوولاّتییەکەی خۆی و سەرۆکی کۆمەلّەی ئیسماعیلیە. لە دەورەی دەسەلاّتی ناسرەدین شادا، لە ڕێگەی کەراچی و بەندەر هەباسەوە دەگەڕێتەوە ئێران.

ئەم سەیروسەفەرەی خۆی ناو ناوە "بیرەوەریەکانی حاجی سەیاحی محەلاتی."

دووسالّ بە سەر هاتنەوەی بۆ ئێران تێپەڕی و دیسا گەڕایەوە ئەورووپا و لە ڕێگەی ئیسلامبولەوە چووە زیارەتی مالّی کابە و، بە ڕێگەی بەغدادا هاتەوە خوڕەمشار و دزفول و لەوێوە خۆی گەیاندە پشتکۆ. بەم چەشنە دەنووسیّ:

“گەڕامەوە و سەیروسەفەرێکی خۆشم کرد و، زۆرم چێژ لە پشتکۆ و پێشکۆ وەرگرت. تەلەگرافێك لە موزەفەرمولك نایبوحکوومەی لوڕستان لە خوڕەماوا گەیشتێ....هتد.”

بە سەمیرەدا تێدەپەڕێت و دەچێتە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی حوسێن قولی خانی والیی پشتکۆ. لەو ناوچەیەدا چاوی بە خەڵکێکی هەژار و ڕەشوڕووت دەکەوێ، تەنانەت ئەو جلوبەرگەی دەبەریاندایە لە سەرما و گەرما نایان پارزێت. دەڵێ هێندە برسی بوون تەنیا پێست و پێشەیان مابۆوە. حاجی سەیاح سەری لەوە سووڕ دەمێنێت وەختێ ئەوانە ئاوا برسین بۆ دەست ناکەن بە چەتەیی و دزیکردن. هەر خۆی وەڵامی خۆی دەداتەوە، لوڕانی پشتکۆ زۆر لە والی دەترسن و ناوێرن لە جێی خۆیان بجووڵێن، والی لە بیانوویەك دەگەڕێ بە کۆمەڵ بیان کوژێت. ئاوا دەنووسێ:

“... ئەم بلەوەز و خوێنمژانە حەز دەکەن هەر کەسێك لەژێر سێبەری دەسەڵاتی ئەواندایە پێستی سەری هەڵقەنن، تاکو نەتوانێ هیچ وەختێ سەربزێوی بکات...”

(فەرموودەکەی حاجی زۆر جوانە هەتا دەسەڵاتدار بمێنێت هەر تاڵاوی ژیان دەکەن بەدەم مرۆڤی ژێر و هەژاراندا). لە “دەی باڵا” ناوەندی پشتکۆ، دەچێتە دیدەنی حوسێن قولی خان” دەڵێ پیاوێکی کەڵەگەتی چوارشانەی زۆر بەسام بوو. ئەوسا دەنووسێ والیی ژنی زۆرە، لە دەم خەڵکی بیستووە والی دوو خوشکی بە یەکەوە مارە کردووە و ئێستەش هەردوویانی لەلایە. والی گوتویەتی: “هیچ تاوان نییە و خاوەنشکۆش ئەو کارەی کردووە کەدیارە مەبەستی لە ناسرەدین شایە”. دکتۆر فووریە پزشکی تایبەتی ناسرەدین شا ئاماژەی بە ژنەکانی خاوەنشکۆ کردووە. دەڵێ: ناسرەدین شا دوو خوشك بە ناوەکانی ئایشە و لەیلای مارە دەکات، رۆژێك ئایشە بە فووریە دەڵێ، لەو رۆژەوە شا ئەویندارى لەیلای خوشکم دەبێ، کار و پیشەم دەبێتە شیوەن و گریان، ئایشە هێندە دەگری چاوێشەی پێوە دەنووسێت.

لێرەدا حاجی سەیاح زۆری بەزەیی بە گوزەران و ژیانی ئەو خەڵکەدا دێت و داوا لە والی دەکات بەبێ ماتڵ کردن ئیزنی بداتێ تاکو سەردانی پشتکۆ بکات. لە ڕێگەی کرماشانەوە بۆ دیتنی خوڕەماوا و بروجێرد وەڕێ دەکەوێ. سەرەتا سەرنج دەداتە باری ژیانی ئەو خەڵکە و دەنووسێ:

"لوڕستان شوێنێکی دەوڵەمەند و پڕ داهاتی ئێرانە و لە چیاکانی خوزستانەوە دەست پێ دەکات تا دەچێتەوە بروجێرد و مەلایر و هەمەدان. لە ڕابردوودا ناوەندی سامان و شارستانییەت بووە... بۆ چارە ڕەشی لەو سەردەمەی ئێستەدا ئەو دەڤەرە جوانەی ئێران و تەنانەت ئاسیا کە دەبوو دەوڵەتێکی مەزنی خاوەن شارستانییەت بەخێو بکات، کەوتۆتە دەست دەستەیەك لە دز و چەتە و گۆران و چەوسێنەر...،ئەو گشتە بەراوە بەبێ بەهرە ماوەتەوە و خەڵکەکەی لەبرسان قڕان دەکەن. ئێران وەختێك دەگەڕێتەوە بۆ دەورانی ژیار و پێشکەوتن کە چەك و چۆڵ لە خەڵك بستێنن و خەڵك چەك بکەن و، هۆز و عەشیرەت نەمێنێ...خەڵك ڕوو بکاتە خوێندن و زانست و شارستانییەت...ئەو لوڕانە وەك ئەوەی دزی و جەردەیی بە پیشە و کشتوکاڵ ناگۆڕنەوە. تا بڵێی جوانچاك و بەژن زراڤ و چاو نەترسن."

حاجی سەیاح لە سەیروسەفەری خۆیدا دەنووسێ: خەڵکی کوردستان لەچاو لوڕستان هێمنتر و ڕێکوپێك ترن. بەپێی بەڵگەکان هەردوو قەومەکە یەك تۆرەمە و ڕەگەزن و کۆنترین ئارییاین.بەهیچ شێوەیەك تێکەڵ ڕەگەزی تورك و عارەبان نەبوون. بە باوەڕی حاجی سەیاح موویی پیاوانی لوڕستان درێژە و ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئاو و هەوای ناوچەکە. دوای ٦ ڕۆژ سەیر و سەفەر لە ڕێگەی هەرسینەوە دەچێتە خوڕەماوا، لەوێ میوانی مزەفەرمولك نایبوحکوومەی لوڕستان و چاوەدێری پێشوویی زەللەسوڵتان دەبێت.

زۆر بە وردی بە خوڕەماوادا دەگەڕێ و دەنووسێ: شارۆچکەیەکی جوان و دڵگیرە و کاروانسەرایەکیان تازە لێ دروست کردووە. پێشنوێژەکەی شار لەچاو خەڵك قاڕوونە و وەجاغیشی کوێرە. هەروەك حاجی سەیاح باس دەکات هەمووشت لەو شارەدا هەرزانە و بە تایبەت گۆشت و ڕۆن و کەو تا بڵێی زۆرە. چاوی بە قەڵای شکۆداری فەلەك ئەفلاك کەوتووە و ئەو ئاوەی بە تەنیشتیدا چۆتە خوارێ و باخاتی هەنار و دواتر دەنووسێ:

"خەڵك تاریفی دەسەڵات و نەزم و نیزامی مزەفەرمولك دەکەن و ئەویش بەردەوام خەریکی گرتن و کوشتن و لێدان و سندم کردنە. کاروان و قەتاری ئێرە ئەسپ و هێسترە و مەڕ و خوری و ڕۆن و پێستە فرۆشە."

حاجی سەیاح دوای چەند رۆژێك سەیر و سەفەر ڕوودەکاتە بروجێرد و لە ڕێگەی زاخەوە هەرچەندە زۆرخۆشە نارِوات، ڕێگەی "پونە" پنگە، کە ڕۆژە ڕێیەکە و زۆریش ناخۆشە دەچێتە شوێنی مەبەست. شەو لە بەهەشتی بەرین دەمێنێتەوە و ئێوارەی دوارۆژ دەگاتە بروجێرد. لەو داشتەدا دەنووسێ:

"سەردانێکی باشی شارەکەم کرد، بەڕاستی بروجێرد شاری سالار و سەروەرانە، زنوێرە و دڵگیر، ڕازاوە بە ئاو و ئاوەدانی و باخ و سەوزەزار. قەڵای شارەکە زۆر خراپە... چەند فێرگە و قوتابخانەی تێدایە. مزگەوتی شا زۆر شکۆدارە... کاروان و قەتاری هەروەك خوڕەماوا و لەویش مەزن ترە. شارلەگەڵ دەوروبەری لە ترسی چەتە و دزانی لوڕ ئاسوودەنین. ئەم ناوچەیە ئەشێت لە دەست فەرمانڕەوایەکی ڕەشید دابێت. زۆر یەك لە پیشەگەرانی دەست نەخشین لە بروجێرد دا دەژین. خەڵکەکەی زۆر وڵاتپارێزن. وەجاخزادەکاتن دەسەڵاتی زۆریان لەسەر خەڵك هەیە."

حاجی سەیاح ماوەیەکی کەم لە بروجێرد دەمێنێتەوە و زۆریش دیاری وەردەگرێ، دەچێتە محەلات تاکو لەوێوە بچێتەوە تاران.



ئەو گەشتیارانەی لەدەورەی نارسەدین شادا سەردانی لوڕستانیان کردووە و سەیروسەفەری خۆیان نووسیوەتەوە دووکەس ماوە ئاماژەیان پێ بکرێت. یەکێ لەو دووکەسە حاجی میرزا ئەولغەفار نەجمومولك، لە ساڵی ١٢٩٧ ك.م. بە فەرمانی ناسرەدین شا، بۆ بەسەر کردنەوەی بەربەستیی ئەهواز و بەراوردکردنی خەرج و چۆنییەتی سازکردنی ئەو بە ڕێگەی بروجێرد و خوڕەماوا دا دەچێتە خوزستان.

نەجمومولك پیاوێکی ڕێکوپێك و وردبین و لە زانستی بیرکاری و ئەدەبی پارسیدا شارەزا بووە و بەرهەمی نووسراوەی بە پێزی لە پاش بەجێ ماوە. باسی ئەو سەفەرە ٩ مانگەیەی لە سەفەرنامەی خوزستاندا نووسیوە. هەروەك خۆی نووسیویەتی لە سەفەری ساڵی ١٢٩٩ ك.م. دا لە ڕێگەی سەرنجە و زالیان چۆتە بروجێرد و هەشت رۆژ لەوێ ماوەتەوە. لەو ماوەیەدا خەریکی دانانی پلان و نەخشەی شارەکە و ڕێگەکانی

دەوروبەری دەبێت، دواتر بە بۆنەی بەفربارینەوە ڕێی لێ دەگیرێ و وڵاخی سواری دەست ناکەوێت. لە درێژەدا دەنووسێ:

" بروجێرد مەزن و وێرانەیە" شوورە و حەساری باشی هەبووە. ئێستە لە زۆر شوێن دیواری لاڕووخاوی بە پێوە ماوە و خەندەکەکەی دەوری شار کوێر بۆتەوە. نێزیکەی ۲۰۰۰۰ کەس لەو شارەدا دەژی تا ۵۰۰۰۰ کەس. چەند گەڕەکی هەیە، کۆڵانەکانی زۆر تەنگ و پیس و شپڕێوە. تەنیا گەڕەکی سۆفیان نەبێ ئەویش نیشتمانی میر و بەگلەرانە و کووچە و کۆڵانی بەرینی هەیە و جۆباری روونی پێدا دەڕوات... دەوروبەری تەواوی باخە ڕەزە... بەهەر لایەکدا دەڕوانی عەمارەتی دوو سێ نهۆمی سەرنجت ڕادەکێشێت، لە شێوەی پاپوێنی فەرەنگی. بەهاری جوان و دڵگیری هەیە، پیشەی چیتسازی لەو شارەدا ناوبانگی دەرکردووە، بەڵام ئاوی خواردنەوەیان خۆش نییە."

نەجمومولك دەڵێ لە هەمەدانەوە گەچ دەهێننە بروجێرد و خەڵواری سێ تمەن دەی فرۆشن. خەڵووز لە لوڕستان دەکڕن و مەنێکی تەورێزی (سێ) کیلۆ بە یەك عەباسی دەفرۆشن. حەساری بروجێرد شەش دەروازە و شارەکەش پێنج کاروانسەرایی تێدا بووە. سەرۆکی کاروباری بازرگانی بروجێرد خواجە محەمەد باقر و زانای ناوداری ئەوێ ئاغا مەلاموحسێن و حاجی میرزا محەمموودە واتە هەر ئەو کەسەی لەگەڵ زەڵلەسوڵتان کەوتنە ناخۆشی.

حاجی میرزا ئەولغەفار نەجمومولك دوای ئەوەی باسی زستانە سەختەکەی ئەو ساڵە دەکات لە بروجێردەوە بەرەو چالانچۆلان دەکەوێتە ڕێ و دەڵێ ئێرە موڵکی ئەحمەدخانی سەرهەنگە واتە حاجی ئەحمەدی یارئەحمەدی. دەڵێ ئەو پیاوە زۆر ژیر و ئاقڵ بووە، ناوی گوندی ئەفرانوەند دەهێنێ کە خەڵکی سکەیی زێڕیان دیتۆتەوە و گوتوویانە ئێرە ئاوایی ئەفراسیاو بووە. باسی بەفرێکی قورس و ڕێبەندانی ڕێگەی کردووە و، نووسیویەتی: دوای پێنج ڕۆژ کەوتن و هەستانەوە لە بەفر و سەرمادا ئەوسا گەیوەتە خوڕەماوا. میزا عەولا مونشی و نایبوحکوومە لەگەڵ دەستەیە لە سوارچاکان و ناودارانی شار لە یەك فرسەقی شار دەچنە پێشوازی. سەبارەت بە فەرمانڕەوای لوڕستان دەنووسێ:

"میرزا موحسێن خانی سەرتیپ مزەفەرومولك و بریکاری زەڵلەسوڵتان نایبویالەی خوڕەماوا و لوڕستان پیاوێکی لێزان و خوێندەوار و شارەزایە...شەو و ڕۆژ خەریکی ڕاپەڕاندنی ئەرکی خۆیەتی و خزمەتی حکوومەت دەکات. لە ڕێکخستنی کاروباری

وڵاتەکەی لە کیسەی خۆی دەبەخشێ و بۆ ئاوەدانی دەکۆشێ. نەمتوانیی لە نێزیکەوە ببینم و لەگەڵی دابنیشم، بەڵام ماوەیەك لە موڵکی ئەودا هاتوچۆم کرد و لە هەموو لایەك بەڕێوەبردنی دەسەڵاتی ئەوم بینی" بەڕاستی بۆ ئەوە دەبێ شانازییان پێوە بکەی."

نەجمومولك حەوت ڕۆژ لە خوڕەماوا دەمێنێتەوە و خەریکی گەڵاڵەکردنی خەریتەکان دەبێ و زانیاری زۆر وەکۆ دەکات. لە بەهەشتی بەرین چاوی بە نووسراوەی سەر بەردێك دەکەوێ، دەڵێ: منارەی شار ۳۱ زەرع بەرزە و ۱۸ زەرع ئەستوورە. قەڵای فلکوئەفلاك، بهەڵە بەناوی حەسەن خانی والی دەنووسێ. دانیشتوانی شارەکە بە ۱۵۰۰۰ کەس دەنووسێ، ۱۰۰۰ کەسیان جوولەکەیە. باسی سەی سادق بەرنوێژی شار دەکات و ناوی میرزا سەدرەدین دەهێنی کە پێشنوێژێکی بێدەات نییە و ساڵی ۲۰۰۰ تمەن دەوو دوو وەردەگرێت، بەڵام میرزا سەدرەدین پیاوێکی هەژارە. لە درێژەدا دەنووسێ: "خوڕەماوا شارێکی پیس و پۆخڵە، ئاووهەوای ناخۆشە و ئاوی زۆر و قورسە و..."

سەبارەت بە سەمیرە دەنووسێ:

"بە ڕاستی خاڵێکی گرینگە. کاتی خۆی شارێکی مەزن بووە. ئەم شوێنە گرینگی خۆی هەیە. دەوڵەت هەرچەندێك بۆ ئاوەدانی خەرجی لێ بکات بە زایە ناچێ، پێ ڕاگەیشتنی لە ڕادە بەدەر ئەنجامی باشی دەبێت."

هەرە وەك دەڵێ بەهۆی ئەوەی مەودای خوڕەماوا و دزفول هیچ گوندێکی لێ نەبووە ناچار دەبێ کەلوپەلی پێویستی ڕۆژانەی لە خوڕەماوا بکڕێت. ڕووداوەکانی ئەو دواییانە سەرنجی ڕادەکێشێت و باسی دەکات و دەڵێ بواری لوڕستان بۆ خوزستان کە ڕێگەی لوڕ و بەختیارییە چۆڵ و ناخۆشە و ئەگەر جادەی بۆ لێ نەدرێ کەس خوزستان بە موڵکی ئێران نازانێت. وەك وڵاتێکی جیاوازە کە ناوی بە ئێرانەوە لکابێت.

نەجمومولك دوای ئەوەی لە خوڕەماوا دەچێتە دەرێ لە ڕێگەی قەڵای نەسیر جودکی و موخبیر ئاوا، تەلەگرافخانەیەکی بچووك دەبینێ، دەچێتە نێو تایەفەی دێرکۆوەندان، وادیارە زریش حورمەتی دەگرن، بەڵام تا کەڵەبابی بەیان دەخوێنێ خەو ناچێتە چاوی. دەزانێ دێرکۆوەندان بەتەمان بە ناوی تایەفەی جودکی بەسەریاندا بدەن و تاڵانیان بکەن و بیانکوژن. دوای ئەوەی سەردانی قەڵای زرێ و ئاوی زاڵ دەکات و دەچێتە گەرمێنی عەشیرەتی بیرانوندان. دەنووسێ سەرۆکی ئەوان حەیدەر خان برای ئەسەدخانە ئەو

کەسەی زەللەسوڵتان لە خوڕەماوا لە داری دا. نەجمومولك ڕۆژی دوایی لە نێزیك مزگەوتەکە لە لای سەیدەکان دەمێنێتەوە و لەوێوە دەچێتە موڵکی خوزستان.



دوایین کەس کە لە دەورەی ناسرەدین شادا چۆتە لوڕستان، بیرەوەرییەکانی خۆی بەناوی سەیر و سەفەری فەرید نووسیوەتەوە کەسێکە بەناوی میرزا محەمەد عەلی خان فەریدومولکی هەمەدانی.

فەرید ومولك لەساڵی ١٢٦٧ ك.م.دا لە دەوروبەری هەمەدان لەدایك بووە، بە گەنجی چووە تاران و لە تۆپخانەی مەبارەکەی ناسرەدین شاەیدا گیرساوەتەوە. لەگەڵ میرزا مەلکوم خانی نازمودەولە وەزیرموختاری ئێران لە ئینگلستان چۆتە لەندەن. بۆ ڕاپەڕاندنی چەند ئەرکێك لەنێو خۆی ئێران دەست دەکات بە سەفەرکردن. بەتایبەت لە ساڵی ١٣١٥ ك.م. لەگەڵ سەردار ئەکرەم والی ئەوسای خوزستان لە ڕێگەی هەمەدان و مەلایر دێتە بروجێرد بۆ ئەوەی لە وێوە بچێتە خوڕەماوا، دواتر سەردانی خوزستان بکات. لە دەرەوەی شار هەر هەموویان لە لایەن دەسەڵاتدارانی دەوڵەت و مێر و بەگلەرانەوە پێشوازیی باشیان لێ دەکرێت. لە درێژەدا دەنووسێ:

"پەلی لە سەربازانی کەزاز لە دەروازەی شار بە ریز وێستابوون و لە کاتی هاتنی سەردار ئەکرەمدا مارشی سەربازییان دەژەنن. بە شانوشکۆیەکی تایبەتەوە گەیشتینە شاری بروجێرد لە شوێنی هۆردوو لە دەروازەی گۆڕی ئاغا لە گەڕەکی سۆفیان دابەزین...دە رۆژ لە بروجێرد مەحتەل بووین تا وڵاخی سواریمان دەست کەوت بۆ کەلوپەل بارکردن. دەبوو نان و پێخۆری دە مزڵ کۆ بکەینەوە و، لەگەڵ خۆمان بیبەین. لەبەرئەوەی لە مەودای ڕێگەی نێوان موڵکی بروجێرد و لوڕستان و عەرەبستان و خوزستان دا خواردن گیر ناکەوێت."

هەر وەك فەریدومولك دەگێڕێتەوە لەو دەورەیەدا فەرمانڕەوای بروجێرد و لوڕستان شازادە حیشمەتودەولە بووە. هەروەك لە سەرچاوەکانی دیکەشدا هاتووە، حیشمەتودەولە، نەوەی فەتەلیشا دوای ئەوەی بووە جێنشینی بابی واتە محەمەد عەلی میرزای دەوڵەتشا دەسەڵاتداری کرماشان، چاوی تەماحی داپچڕی کە بروجێرد و لوڕستان

لە مامی خۆی واتە حیساموسەلتەنە بستێنێ و دوای شەڕێکی خوێناوی دەستی دەئەستۆی بووکی ئاواتی کرد. ناچار فەتەلیشا دەمڕاستێکی کردە نێوبژیوانی کوڕ و نەوەکەی و هەر یەکەیانی گێڕایەوە بۆ سەر دەسەڵاتی پێشوو.

فریدولمولك لە بروجێرد ئاڵووێری تریاکدا دەبینێ و دەڵێ، لە کاروانسەرایەك ڕۆژی دوو هەزار تمەن تریاك دەکڕن و دەیفرۆشن. مافوورە و قاڵی، بازاڕیان گەرمە و ڕەوانەی تەورێز و رووسیە دەکرێن. دەنووسێ، زۆرینەی موڵکدارانی بروجێرد هۆزی سەیدەکاتنی تەباتەبایین.

فەریدومولکی هەمەدانی لەگەڵ دەستەیەك چەکداری ٥٠٠ کەسی بە سەرۆکایەتیی سەردار ئەکرەم والی خوزستان و ١٥٠ سوار کێشکچیی ماڵی شاسەوەن لە بروجێردەوە بەرەو خورەماوا دەکەونە ڕێ. لە سەراوی هەڵوا سازانەوە دەڕۆن و سوارەکانی یارئەحمەدی دێنە پێشوازی سەردار ئەکەرم و دەگەنە چالانچۆلان. بەدەم ڕێگەوە زاخەکان دەبینێ و چاوی بە هۆردوویی دەوڵەت دەکەوێ و دەنووسێ، هاتوون ماڵیات لە لوڕەکان بستێنن.

هەروەها، لە مانگی سەفەری ١٣١٥ ك.م. دا، دەستەی فەریدومولك و سەردار ئەکرەم لەگەڵ پێشوازیی سوارانی سەگوەند دەچنە شاری خورەماوا، زۆر بە وردی تاریفی سەربازخانەی شارەکە دەکات، کاتی خۆی حاجی میرزا موحسێن خانی مزەفەرمولك بەردی بناخەی داناوە و زۆریەك لە ئاسەوارەکانی نۆژەن کردۆتەوە. سەبارەت بە منارەی شارەکە دەنووسێ خەڵك دەڵێن، ئەو منارەیە پێشتر مزگەوت بووە، ئیمام حوسێن لێرە سازی کردووە. لێی زیاد دەکات و دەڵێ:

"دەنووسێ خورەماوا لە سای دار و باخی زۆر و چۆم و کانیاوی تا بڵێی ئاوەدان و دڵگیرە، بەڵام وەك هەستی پێ دەکەی ئاووهەوای خراپی هەیە و مرۆڤ تووشی نۆبەتێ دەکات. ئەو برنجەی لە خورەماوا بەرهەم دێت، زۆر لە برنجی مازەندەران باشترە... نایبوحکوومە شاروخ میرزا بوو لە لایەن نەواب ئەشرەفی خاوەن پلە حشمەتودەولە لەگەڵ محەمەد عەلی خانی سەرۆك عەشیرەتی سەگوەندان واتە سەرتیپ، هاتبوونە دیدەنی سەردار ئەکرەم.

بەقەولی نووسراوەی فەریدومولك ئەمینداری ڕێگەی لوڕستان تا خوزستانی بە لوڕەکان سپاردووە، پارە وەردەگرن و ئەمانەتی ڕێگەکان دەپارێزرن و کاروانی بەبێ ترس

و گومان درێژە بە کاری خۆیان و ڕێگەی خۆیان ئەدن. دەستەی جودکی ئاگەداریی ڕێگەی باشووری لوڕستان و خوزستانیان لە ئەستۆیە. هێزی میری ناودار و بەناوبانگ و براکانی و دەستەی میرتەقی، دەوڵەت ساڵێ بۆ هەر سوارێك چل تمەن و بۆ پیادەیەك ساڵی بیست تمەن مووچەی بۆ داناون بۆ ئەوەی قەتار و کاروانی بە ئاسوودەیی بپەڕنەوە. سەبارەت بە جلوبەرگ و حاڵی سەرۆك هۆزەکان دەڵێ ئەوان ڕیش و پرچیان هەیە و پشتێنی ئەستوور لە پشت دەبەستن و، کەوای ئاودامێن دەکەنە بەر و، تەپڵەی ڕەش لەسەر دەنێن، هەموویان جبەی تەنکی پەشمینە دەدەن بەشاندا، پاتۆڵی پێیان زۆر هەراوە و بەسواری ماین دێن و دەچن.



لەنێو ئەو لێتۆژانەی کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیست، کە سەردانی لوڕستانیان کردووە و باسی سەیر و سەفەری خۆیان نووسیوەتەوە، جێی خۆیەتی ئاماژە بکەینەسەر "لۆرد کروزێن بارون و مارکزی یەکەمی بریتانیا. ساڵی ١٨٥٩ ز. لە دایك بووە و دوای ئەوەی خوێندنی لە زانکۆی ئاکسفۆرد تەواو کرد، دەستی کردووە بە سەیر و سەفەر لە ئاسیا، نێزیکەی شەش ساڵ بوو بە نایبوسەڵتەنە و فەرمانڕەوای تەواوی هیندستان. ماوەیەکیش بوو بە سەرۆکی زانکۆی ئەکسفۆرد. ساڵی ١٩١٩ ز. گەیشتە وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا و ماوەی پێنج ساڵ تێیدا مایەوە. ئەنجومەنی جوگرافیای سەڵتەنەتی بریتانیا بەبۆنەیی توێژینەوەکانی ئەو مێداڵی ئاڵتوونی پێ بەخشی. جۆرج ناتانبل کروزێن لە سەیراننامەی خۆیدا بۆ ئێران، بە دڵی خۆی سەردانی لوڕستانی نەکردووە، بەڵام لە سەفەرنامەکەیدا توێژینەوەیەکی ەزرڤانانەی کردووە لەسەر ئەم ناوچەیە. سەبارەت بە بنەچەکەی لوڕان هەروەك باقی گەشیاران لەسەری نووسیون. دەنووسێ: ئاخۆم لوڕان لە چ هۆز و بەرەبابێك و لە کوێوە هاتوون ئەمە ڕازێکە سەر بە مۆر لە مێژوودا، بەڵام دەڵێ زۆرینەی نووسەر و ڕاڤەکاران لەسەر ئەم گفتەن کە لوڕەکان بە ڕەگەز دەچنەوە سەر ئارياييەکان و بەر لە هاتنی تازی و تورك و تاتارەکان لەم وڵاتەدا ژیاون. زمانیان تێکەڵ بە فارسی کەونارایە و تا ڕادەیەکیش لەگەڵ پهەلەوی

هاوکێشی هەیە. بە دڵنیایەوە دەکرێ بێژین لوڕەکان لە پاشماوەی تۆرەمە و ڕەگەزێکن، بە گفتی مارکۆپۆلۆ لەو هەشت میرنشینەن کە وەختی خۆی لە ئێران ژیاون.

کرۆزێن هەردوو تایەفەی مەزنی پشتکۆی بە گولەك و سلۆرزییەکان یاداشت کردووە، ئەوانە بە سەر چەند بەرەبابدات هاوێر دەکات. دەڵێ لە نێوان باڵاگرێوەدا ئێستەش دێرکۆوەندان ژێر دەستی لە مێژینەی خۆیان لە کاروباری گێچەڵ و ئاژاوەگێڕیدا دەگرنە ژێربالّی خۆیان. دەڵێ سەرکردەی ئەوان کەسێکە بەناوی میر حاجی، بابگەینە سەفەرنامەی ویلسین بە پوختی باسی دەکەین. لەو سەرەوە دەوڵەت بە حاجی و برازاکەی خەڵات بەرات دەبەخشێت بۆ ئەوەی دزەکانی دیکە بخاتە تەڵەوە. ئەو دووە بۆ خوێنی سەری یەکدی توونین. ئەگەر خۆبەخۆ سەری یەکدی نەخۆن ئەوا ڕێبواران و کاروانچی ڕووت دەکەن و، تەنانەت دەشیان کوژن.

نفووسی خوڕەماوای ۲۰۰۰۰ کەس نووسیوە، دەڵێ کۆشکی وێرانی شار کە تایبەت بە ئەتابەکانی لوڕ بوو، بە قەڵا و منارەیەوە بەپێوەیە و لەسەر زنارێك ساز کراوە. زۆریش لە قەڵاکانی ڕۆخی ڕووباری ڕاینی، ئەورووپا دەچێت. بەوردی ناوی حوسێن قولی خان دەهێنێ و دەنووسێ بێجگە لەوەی ئەمیر و سالار بوو لەچاو ئێرانییەکان ۷۰۰ سوار و ۲۰۰۰ پیادەی هەیە و تەنانەت ۳۰۰۰۰ چەکداری بۆ کۆ دەبێتەوە. کەمتر وا هەیە لە بنکەی خۆی دوور بکەوێتەوە. ڕووخۆش و زمانپاراوە و زۆر بەسامە و بە ئەبوقەدارە ناوی دێنن. تەمەنی تازە لە ٥٥ ساڵ ئاوا بووە، بەڵام مەینۆشی زۆری شکاندوەتەوە.

هەروەك لۆرد کرۆزێن دەنووسێ هێڵی تەلەگراف بە شارەکانی خوڕەماوا و بروجێرد و کرماشان و شارە دێیەکانداڕاکێشراوە و پێشکۆ بۆتە هێلکەیەك بە دەست رووسیەوە، بەڵام پشتکۆ وا نییە. بروجێرد، وەك ناوەندێکی فەرمانڕەوایی باس دەکات کەچی زۆرتر تایبەت بە ئەراك بووە. بە وتەی ئەو پیاوە گەڕۆکە لە چەندین ناوچەی بروجێرد بەشێك لە بەختیاری گەل، ماڵ و حاڵیان هەیە و دەسەڵاتی ئەو شارە باڵی وەسەر کێشاون و بەشێك لە ماڵیاتی بەختیاری وەردەگرێت.

دانیشتوانی بروجێرد ۱۷۰۰۰ کەس تۆماردەکات، بەهۆی ئەوەی شاری بروجێرد لەسەر ڕێگەی دزفول و کرماشان و هەمەدان و تاران و ئیسفەهانە لە بواری بازرگانیدا تایبەتمەندیی خۆی هەیە. دەوری حەسارگوڵی بروجێرد پێنج میل یان هەشت کیلۆمیر و

کۆی دەروازەکان پێنج دەروازە دەنووسێت. جۆلایی و هومایی چنینی بروجێرد بەرز دەنرخێنێت. دەنووسێ هۆزی لورِ بەگشتی لە ساڵی ١٨٨٨ ز. ١٣٠٦ ك.م.دا واتە لە دەوروبەری دوایین هەناسەکانی دەسەلاتی ناسرەدین شادا، ٧٨٠٠٠٠ کەس و دانیشتووانی ئێران شەش ملیۆن تۆمار دەکات.

* * *

ژاك ماری دومۆرگان خەڵکی فەرەنسا و ئەندازیاری کانگە سروشتییەکان بوو. ساڵی ١٨٨٩ لەسەر بانگ هێشتنی وەزیری فەرهەنگی ناسرەدین شا، لە لایەن دەوڵەتی فەرانسەوە بۆ کاروباری ئاسەوارناسی دێتە ئێران. لەسەر چاوە فارسیەکاندا هاتووە دومۆرگان سێ ساڵ لەئێران ماوەتەوە و خەریکی کار و لێکۆڵینەوە بووە و لە پێنج کتێب بدات لە چاپیداوە. دومۆرگان سەرنجێکی زۆری داوە بە ئاسەواری کۆنی ئێرانی و دەوڵەتی فەرەنسەی هەڵپێچاوە بۆ هەڵکۆڵینی شوێنە کۆنەکانی ئێران پشك وەربگرێت. وەزیری ئەوسایی فەرانسە لە ساڵی ١٨٩٤ ز.دا ڕەزایەتی لە ناسرەدین شا وەرگرت بۆ وەدەستهێنانی پاوانکردنی بەشی ئاسەوارکۆڵی لە تەواوی ئێراندا. ئەم بەشە لە دەسەلاتی ناسرەدین شادا مۆری زانستیی لێدرا. دوای ئەوە شاندێکی زانستیی فەرەنسە بە سەرۆکایەتیی دومۆرگان هاتنە ئێران و لە شاری شووش ڕا دەستیان کرد بە کارەکانیان.

لەوێدا چەند ئەنتیکەیەکی بە نرخیان دۆزییەوە و ئەو کۆڵەکەبەردە نزمانەی یاسای حەموراِبی و قانوونی تۆمارکراوی جیهانی کە ٢٠٠٠ ساڵ پێش لەدایکبوونی مەسیحی لەسەر نووسرابوو بەدەست هێنا و، لەگەڵ زۆر شوێنەواری گرانبایی ڕایان گوێزا بۆ مۆزەخانەی لوری پاریس.

لەگەڵ شارەزایەکی بواری کەوناراناسی سەبارەت بەم ئاسەوارە چەند پەیڤێکمان هێنایە بەر باس، باوەڕی وابوو ئەگەر ئەو ئەنتیکانە ئێستەش هەر لە ئێران مابان یان تۆز و خۆڵیان لەسەر دەنیشت یان داخۆ چ بەلایەکیان بەسەر دەهات و وەك ئێستە لە مۆزەخانەی بیانیدا لە جامخانەدا نەدەکەوتنە بەر دیدی بینەر و تامەزرۆیان، بەلام ئێستەکێ فەرانسە مۆزەی لووری کردۆتە شوێنێکی سەرنجڕاکێشی دنیا و گەشتیاران لە

گشت لایەکەوە دەچنە سەردانی. ئەو خەزێنە بەتالاّنچووە بۆ ئەوان بۆتە سەرچاوەی داهاتێکی باش.

ژاك دومۆرگان سەرەتا بەشێکی زۆری ئێران گەڕاوە و لەمەڕ زەویناسییەوە زۆری لێکۆڵێنەوە کردووە. ئەو مرۆڤە تەواوی شیکاری و زانستەکانی خۆی کە لەگەڵوەفدە فەرەنسییەکە کردوویەتی وەك سەفەرنامەیەك چاپی کردووە. دەکرێ بڵێین ئەوە یەکەم کەسێکە ڕیشاڵە نەوتیەکانی لە کێوەکانی بەختیاری دا دۆزیەوە و بە دنیای زانستی ناساند. ئەم ڕیشاڵە نەوتییە لە (کەرکووکەوە تا مزگەوتی سلێمان) بەردەوامە. دومۆرگان سەرەتا زانیاریی باش دەخاتە بەر چاوی گەشتیاران، بۆ نموونە سەبارەت بە کەلوپەل و وڵاخەبەرزە، دەنووسێ: لە ئێران کرێی فەرسەخێك بە شێوەی چەپەری قڕانێکە و، بە ئەسپ شتێ کەمترە، کەس لە ڕۆژێکدا ناتوانێ لە مزڵێك واتە ٤ فرسەخ بەرامەبەر بە ٢٤ کیلۆ میتر سەفەر بکات. خەرجی هات و چۆ بە وڵاخی باری ڕۆژی پێنج قڕان دەستێنن واتە ٤٢ فرانك. داوا لە گەشتیاران دەکات ئەگەرە بۆ ماوەی درێژخایەن دەمێننەوە چارە ئەوەیە یەك سمان بەکرێ بگرن و مانگانە پارەیەك بدەن بە کابرای کەردار. لە مانگدا پارەی کەردارێکی باش سێ تمەن و بۆ هەر هێسترێکی بەقەوەت ٢٠ تا ٣٠ تمەن تەواوە.

سەبارەت بە خەڵکی ئێران دەنووسێ ئێرانی گەلێ خۆشنشین و خانومان بە حورمەت و میوانگرن. خەڵکی ئاسایی کۆڵان و بازاڕ، چەنەوەر و بێموبالات، تەنانەت زۆریش ترسنۆك و هیچ و پووچن. گەڕۆکان ڕادەسپێرێت بە هیچ کلۆجێك گرینگی نەدەنە ژن و منداڵی ئەو خەڵکە. ئەگەر بێت و ژیرانە هەڵسوکەوت نەکەن زمانی سووریان سەری سەوزیان بەبادا دەدات" دیسا ڕاسپاردەی ئەوەیە گەشتیاران نەك یەك و دوو با چەند خزمەتکاری خۆیان لەگەڵدا بێت.

ئەو گەشتیارە فەرەنسیە، لە یەکەم سەفەری خۆیدا سەرەتای ساڵی ١٨٩٠ ز. دوای ئەوەی دێتە باکووری ئێران و ئازەر بایجان بە ڕێگەی کوردستان و کرماشاندا دەچێتە شیروان و پشتکۆ. وەك سوڵتانێکی بچووك باسی حوسێن قولیخان والیی پشتکۆ دەکات کە فەرمانڕەوای بەشی کوێستانی ژێر دەسەلاّتی خۆیەتی. دەنووسێ والی حەز ناکات نە ئێرانی و نە ئەورووپی سەردانی دەڤەرەکەی بکەن و ئەمنییەتی لێ بشێوێنن. بە پێی نووسراوی

مۆرگان والی لە پێشدا زۆر بە ساردوسڕی وەری دەگرێت، بەڵام وەختێ گوێ لە ئەو زانا فەرەنسییە دەگرێ و ڕابێژی لەمەڕ ئاویاری کشتوکاڵییەوە دەبیستێ سەیوانی حورمەتی بۆ هەڵ دەدات و مانگێك لە لای والی لە پشتکۆ دەمێنێتەوە. لەوێوە دەچێتە دۆڵی سەمیرە بۆ ئەوەی سەردانی خوڕەماوا بکات. دەڵێ ئەو مەودایە زۆر ناخۆش و پڕمەترسییە و دانیشتوانی بە چاوی سووکەوە سەیری گەشتیارانی بیانی دەکەن.

مەودای سمیرە تا خوڕەماوا بە پازدە ڕۆژ دەبڕێت و چوار ڕۆژ لە خوڕەماوا دەمێنێتەوە. شتێکی وایی لێرەدا باس نەکردووە تەنیا ئەوە نەبێ نووسیویەتی خەریتەی باج و پیتاکی زەویوزاری دارشتووە و پلانی بۆ داناون. ئەوسا لە ڕێگەی هۆردوو چۆتە بروجێرد و نووسیویەتی هەشت ڕۆژ پێش ئەوەی بگاتە ئەوێ لوڕان ئاو شارەیان تالآن کردووە، دەسەڵاتداری شار بە ناوی سەرتیپ سەیفوڵڵا دوای کوشتارێکی باش شارەکە ڕزگار دەکات. مەچەکی سیانزە کەس لە سەرۆك هۆزەکان دەپەڕێنێ و لێیان دەگەڕێ دوای ئەوەی تەواو خوێنیان لەبەر دەڕوات، گیانیان دەردەچێ. دەمودەست هەر لەوێ دوانیان گوللەباران دەکات. ئێستەش هەر بۆیە ڕێگەی هۆردوو ئارام و بێدەنگە.

وەکو شیو و دۆڵێکی خاوەن داهات باسی بروجێرد دەکات لە دەرەوەی لوڕستان" دەڵێ ناوچەیەکی جیاوازە و کەوتۆتە نێوان ئەلوەند و کەنگاوەر و سولتاناوا. ماوەی دوو مانگ لەو ناوچەیەدا ماوەتەوە و سەیروسەفەری کردوە و خەریکی تۆمارکردنی خەریتە بووە. دیسان گەڕاوەتەوە بروجێرد و ئەمجارە سەرتیپ سەیفولا، یان سەیفولمولك ئەمیرخانی سەردار، فەرمانڕەوا لە شاردا نابینێت، پێی دەڵێن سەردار ٦٠٠ چەکداری لەگەڵ خۆی بردووە و چۆتە باشوور بۆ تەمبێکردنی سەرۆکی لوڕان.

ماوەیەك دواتر سەیفولاخان چەند نامەیەکی ڕاسپاردەیی بەو پیاوەدا دەنێرێ بۆ لوڕەکان، بەڵام دومۆرگان وەختێ لەنێو ڕێدا سەرنجیان دەدات، دەبینێ زۆر بێ بایەخن، لەبەرئەوەی لە ڕێگەی کوێستانی بروجێرد بۆ شوشتەر چەند جارێك کەوتۆتە بەر پەلاماری خێڵی حاجی وەند. بە ناچاری خۆی دەگەیەنێتە دەوروبەری شوشتەر و تا ڕادەیەك دلۆڤانی لە سەگوەندانی ناوچەکە دەبینێت. ئەو کێوی هەشتا پاڵوو بە ناوچەی لوڕانی دێرکۆوەند یان دەشتی کیانی دزێو ناو دەبات. وای بەباش زانیوە بە تالۆکە لەوێندەرێ بشتەدەرێ و بە پردی گامێشاندا بچێتە خوزستان. لەسەر تایبەت مەندی

ناوچەکە بۆچوونی خۆی ئاوا دەربڕیوە: دەشتی خاوە شوێنی زەریاچەیەکی مەزن بووە بەربەستە سروشتییەکەی خۆی شکاندووە و بۆتە ئەو دەشتە سەرنجڕاکێشەی ئێستەکە. مۆرگان دەڵێ، ئێرانی و بە گشتیی موسڵمان و عارەب پێ لە هەر جێیەك دانێن سەوزایی لێ دەبڕن، بەبێ ئەوەی پێویست بێت دار و درەختی دەبڕن و کۆلکەی لە ڕەگەوە دەردەهێنن.

سەبارەت بە بیروباوەڕی مەزەب و ئاینی لوڕەکان نووسیویەتی، لوڕ و کورد چشتێ لە محەمەد و ئاینەکەی نازانن، زۆریان بڕوا بە قسان و چاك پیران هەیە و، لە نێزیك کێوی هەشتا پاڵوو شوانە لوڕەکانی دیتوە گۆشتی بەرازیان خواردووە و خۆشیان بە موسڵمان زانیوە. دەڵێ: عەشیرەتی لوڕ زۆر کەللەڕەقن و هەر ئەوەندە لە ئاینی محەمەدی فێر بوون ڕقیان لە خەڵکی بیانی بێتەوە و بیانکوژن.



گومان بۆ ئەوە دەچێت خاتوو ئیزابلا بیشوپ لەو گەشیارانەبێت لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا سەردانی ئێران ی کردووە. ئاماژەیەکی کورتی بە لوڕستان کردووە. ئەو سەیر و سەفەری لەولاتی ئێران بە ناوی سەفەرنامەی ئێران و کوردستان لە ساڵی ١٨٩١ ز.دا چاپ کردووە، بەشێکی سەبارەت بە بەختیاری و عەشیرەتی ناوەخۆی خوزستان خستۆتە بەر تۆژینەوە.

لەمەڕ ناسینی خاتوو بیشوپ زانیاریی ئەوتۆمان نییە هەر ئەوندە نەبێ دەزانین لە ساڵی ١٨٣٢ ز. لە ئینگلستان هاتۆتە دنیا و سەیر و سەفەرێکی زۆری کردووە. ماوەیەك مامۆستای زانکۆ بووە، دواتر دەستی داوەتە کاروباری نووسین و چەند کتێبێکی لە دوای خۆی بەجێ هێشتووە. ئەوە یەکەمین خاتوونێك بووە لە ئەنجومەنی پاشایی جوگرافیای لەندەن دا بووە بە ئەندام و دوای ٧٢ ساڵ تەمەن ماڵاوایی لە ژیان کردووە.

هەر وەك لە سەرچاوەکاندا بۆمان دەرکەوتووە، خاتوو بیشوپ لە ساڵی ١٨٩٠ ز. بە هەڵکەوت تووشی کاربەدەستێکی ئێدارەی ئاگەداری هێند و بریتانیا دەبێ بەناوی ساویر، لەگەڵ ئەوسەرگوردە بەشێکی زۆری ناوچەی زاگرۆس بەسەر دەکاتەوە. زۆرکەس دەڵێن تووشی کۆمەڵێك بەلاو گرفت بووە، بەلام لە مردن گەڕاوەتەوە. بە خۆڕایی نییە

دومۆرگان دەڵێ لوڕ و بەختیاری ئەگەر ئافرەتی بیانی ببینن بەتایبەت ئەگەر پۆشتە بێت کاریان پێی نییە و لەگەڵی بە حورمەتن.

بەڵێ، ختووئیزابلالوسی بیشۆپ، ساڵی ١٨٩٠ ز. لە ڕێگەی بەغدا و کرماشانەوە هاتۆتە ئێران، چاوی بە تاران ئیسفەهان کەوتووە و دوای سێ مانگ سەیران گەشت لەنێو بەختیاریدا بە خوڕەماوا و بروجێرد دا لە ڕێگەی هەمەدانەوە سەردانی کوردستانی کردووە.

بیشوپ سەرەتا سەبارت بە لوڕی بچووك دەنووسێ و باسی مەڵبەندی لوڕی کۆچەر دەکات و لوڕی فەیلی بەباتەوە نێوان رووباری دز و دەشتی ئاشوور و لای باکووری کرماشان، ئەویش تاکو باکووری مەڵبەندی شووش پانتایی هەیە. لوڕی بچووکی لەچاو ژمارەی بەختیاری گەل زۆرتر نووسیوە و راولسین دەنووسێ: لوڕانی فەیلی بەگشتیی لە ساڵی ١٨٣٠ ز. نێزیکەی ٥٦٠٠٠ بنەماڵەیە. دیسان دەنووسێ لوڕانی فەیلی وەك بەختیاری دراوسێی خۆیان دەسەڵاتداری فیوداڵیان نییە و لە تایەفەکاندا خانی خاوەن دەسەڵات نابینرێ، لەنێو هەر بەرەبابێکدا چوار یان پێنج توشماڵ و کوێخا سەر پەرشتی تایەفە دەکەن. بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری خۆیان و کەمکردنەوەی گرفت و بە ڕێ و جێی عەشیرەتی باش هەوڵ ئەدەن، هەربۆیە راولیسن دەڵێ حکوومەتداری لە لەو هۆزە جوانە و تەنانەت وێنەی لوڕانی بچووك لەنێو گەلانی ئاسیادا کەم دەبینرێ. دەکرێ بڵێین تاڕادەیەك دەسەڵاتی فیدراڵیان هەیە.

خاتوو بیشوپ باوەڕی وابووە زمانی لوڕی کەمەکێك لەگەڵ زمانی کرماشانی جیاوازی هەیە. دەڵێ لوڕەکان بە پێچەوانەی بەختیارییەکان زۆر هۆگری کاروباری کشتوکاڵ نین، بەڵام لە پەروەردە و بەخێوکردنی هێستر و کاروباری بازرگانی مافورە و خەڵووز و حهیوانی وردە، زۆر ئازان و ئەو شتانە بە دەوروبەری خۆیان دەفرۆشن.

ناوچەی لوڕستان بۆ کاروباری ئابووریی ئینگلستان بە گرینگ دەزانێ و پێی وایە ڕێگە بۆ دەرچوونی عەرابەی نێوان ئەهواز و تاران لە ماوەی دووساڵدا تەواو دەبێ. بەشێکی بە مەڵبەندی لوڕستان دەزانێت. توجارەتی ڕێگەی کەنداوی فارس لە داهاتوودا دەگێڕێتەوە بۆ خێرخوازیی لوڕەکان لە ناوچەکەدا یان هێزی دەوڵەتی ناوەندی. دوای ئەم پێشەکییە ساڵی ١٨٩٠ ز. ماوەی سێ مانگ لەنێو تایەفەی بەختیاریدا دەچێتە ناوچەی کەشکان و بە کاروانەڕێی خوڕەماوادا درێژە بە سەفەرەکەی دەدات و دەنووسێ:

“دوای دەرچوون بەسەر دوو پردەکەدا، لە دوورەوە باخەکانی خوڕەماوا دەرکەوتن، شارەکە لە باوەشی زنار و چیای بەرز و قەڵایەکی رووخاودایە. دیمەنی ڕەوەز و شاخی دڵگیری زۆر سەرنجڕاکێشە... شەو زۆر بە ڕێگەدا هاتبووم، گەرمای زۆریش تەواو ماندووی کردبووم و لەژێر دارێك پاڵ کەوتم، وەختێ هەستم کرد کەسێك بە فەرەنسییەکی پاراو قسە دەکات. ئەوە فەرمانڕەوای شارەکە بوو بۆ دیدەنیی من هاتبوو. چەند سوار چاکێکی لەگەڵ بوو... لە لایەن ئەوەوە، چوار کەس لە نۆکەرانی هەندێك میوە و شیرنییان بە دیاری پێدام.”

خوڕەماوا نێزیکەی ٤٠٥٠ پێ، بەرانبەر بە ١٢٥٠ لە دەریا بەرزترە گەرمای ئەوشارە لە مانگی گەلاوێژ دا تەواو وەك دەشت و بیابانیی هیندستان وایە و لەوپەڕی خراپیدایە. بەهۆی ئەوەی زۆر لە ڕێگە ماندوو بووە وچان دەگرێت و، بەتەواوی خۆی دەحەسێنێتەوە و تەنیابە چاوپێکەوتنی حاکمی لوڕستان و ژنەکانی ئەو قنیات دەکات. لە باخی مەزنی ئەم دەسەڵاتدارە دا کە پڕبووە لە دار و درەختی سەرو و هەنار و گوڵی ڕەنگین. بە چایی و نێرگەلە میواندریان لێکردووە. ئەوسا دەنووسێ:

“بەو جۆرەی بۆم دەرکەوت ئەو نازیلە و نازدارەی کە دڵی فەرمانڕەوای داگیر کردووە، کیژۆڵەیەکی چاردەساڵەی جوانی لەبارە. هۆدەی ئافرەتەکان زۆر جوان و ڕازاوە بوو جلکی ژنان لەوپەڕی جوانیدا... دوای ئەوەی سەردانێکی پاشماوەی قەڵامان کرد و سەیری شێوازی تەلارسازی ئەو دەورانە، چوومە دیتنی بازاڕ...بازاڕی خوڕەماوا چکۆلە و ناخۆش و کۆڵانەکانی هەموویی تێکەڵ کێشن، ڕەنگە کاتی خۆی سەنگ فەرش کرابێت ئێستە هەمووی قووڵکە قووڵکەیە... ئەوەی سەرنجی ڕادەکێشام خەڵکە پشتکووڕ و کۆمەکەی ئەوێ وادیار بوو زۆر هەژار و برسین. بازرگانان بەوپەڕی سارد و سڕی و بێ دەسەڵاتییەوە دەیان گوت هیچ سات و سەوداییەك نییە” لوڕانی فەیلی بوونەتە چەتە و ڕێگر و کاروان و قەتاران ڕووت دەکەن...هەرچەندە دەوڵەت هێزێکی سەربازی بۆ تەناهیی ڕێگەکان داناوە، بەڵام هەروەك خۆی وایە.”

بیشوپ باسی پردێکی جوانی بیبست و هەشت هۆدەیی دەکات، ٦ مەتر پان و نێزیکەی ٣٠٠ مەتر لاکێشی، ڕێبواران دەباتە نێو حەساری خوڕەوا، دەنووسێ کاروەنسەرایەکی جوان سەردەرانەی کاشی کاری کراوە و لە شانی چەپی پردەکە جێی

حەسانەوەی ڕێبوارانە. دەڵێ برج و منارەی شارەکە وەك خۆی ماوەتەوە و لەبەشی لای سەروویی کەتیبە و بەردەنووسی بە خەتی کووفی پێوە دیارە.

دوای مانەوەیکی کورەت چۆتە بروجێرد و سەرەتا لەو شارەدا باسی ژمارەی دانیشتووانی ١٢٠٠٠ تا١٨٠٠٠ کەسی دەکات و دەنووسێ لە بروجێرد تەلەگراف خانەیەك، پۆسخانەیەك، چەند مزگەوتی بچووك، چەند فێرگەیەك، سێ گەرماوی گشتی و شەش کاروانسەرەی لێیە، لە درێژەدا:

"بروجێرد فەرش و قاڵی باشی هەیە. بازاڕی بروجێرد ڕووناك و بەرینە و پڕە لە پێداویستی خەڵکی و دووکانەکان بە کەلوپەلی ئەورووپایی و رووسی ڕازاوەتەوە و لە هەموو چەشن کوتاڵی کەتانی رووسی و ئینگلیزی و چرای نەوتی نەمسایی، ئاوێنەی رووسی، وێنەی بنەماڵەی پادشایی رووسیەی، سەماوەر و تەپڵەك و ئیستیکان، پارچە و قوماشی پەشمینەی رووسی، کەللەشەکری رووسی و چینی...هەرچەندە بازاڕی بروجێرد دڵگیر و جێی سەرنجە کەم واهەیە ئافرەتێکی فەرنگی لەنێو ئەوهەمووخەڵکەدا ببینی. خەڵکەکە دەوریان گرتم و پارێزەرەکانم هەروەك هەمیشە بەدار و بەرد دووریان خستنەوە."

دوای ئەم هەموو دیدەنییە سەبارەت بە باری کشتوکاڵ و باخات و حەوت جۆر ترێی بروجێرد دەنووسێ. لەمەڕ دەریاچەی گوڵ گەوهەر ئەدوێ لە داوێنی باشووری وشتران چیادا. هەربۆیە زۆریەك لە ئەورووپاییان دۆزینەوەی ئەو درەیاچەیە لە بەشی کوێستانیدا لەو خاتوونەڕا دەزانن، بەڵام گابریل ئالفونس لێکۆڵینەوەی خۆی لەسەر ئێران دەست پێکردووە و دوای کۆکردنەوە دەنووسێت لە پێش بیشوپ دا گەشتیارێك بە ناوی رودلێر لە ساڵی ١٨٨٨ ناوی ئەوی لە یاداشتەکانی خۆیدا هێناوە، هەروەها دۆزینەوەی ئەودەریاچەیە وا ئەورووپیەکان پێی دەڵێن "ئێرنە" بە ناوی ئەو پێوەندی دەدات.

# (٣)

# گەشتیارانی سەدەی بیستەم

ورده ورده لە سەرەتای سەدەی بیستەم نێزیك دەبینەوە و تەڤگەری گەشتیاران بۆ ئێران بەتایبەت بۆ لوڕستان ڕوو لە زۆربوون دەبێت، بەڵام لەچاو ئەو زۆر بوونە سەفەرنامەکان زۆر کەمترن، هۆکاریش ئەوەیە لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا بەرەبەرە سەیروسەفەر لە خۆر هەڵات لە بازنەی دەسەڵاتی ژیر و ئاقڵمەندان دەچێتە دەرێ و ڕوخسارێکی گشتی تر بەخۆیەوە دەگرێت. لەبەرئەوەی سەیاحەتنامەی ئەوانەی بەرێ کارێکی وای کرد تامەزرۆیان بە لێشاو لووزەو ببەستن و، زۆر و بۆر بێنە خوارێ، بەتایبەت دەوڵەمەند و خۆشگوزەرانانی ئەورووپایی.

جێی خۆیەتی لەنێو خێزەرەی ئەو گەڕۆکانەدا لە ئاخر و ئۆخری سەدەی نۆزدەدا کە پێی لەسەر خاکی لوڕستان دانا، ناوی خاتوو دووراند هاوژینی مورتیمور دووراند وەزیر موختاری ئینگلیز بێنین لەساڵەکانی ١٩٠٠ — ١٨٩٤ هاتۆتە ئێران. بە هاوڕێی مێردەکەی و نۆکەر و غوەڵامان نێزیکەی ١٠٠ کەس و قەتارێکی ٢٩٠ سەر ئەسپ و هێستر، بە بەشێك لە باشووری ئێراندا گەڕاوە. ئەو خاتوونە سەیراننامەی خۆی لەژێر ناوی "سەفەرنامەی دووراند" بڵاو کردۆتەوە کە تایبەتە بە سەفەری وەفدی سێرمورتیمور دووراند.

خاتوو دووراند لەو سەفەرەیدا مەبەستی چاو پێکەوتن بووە لەگەڵ شازادە زەللەسوڵتان برای موزەفەرەدین شا و دیتنی ئیسفەهان وناسینی خاکی لوڕانی بەختیاری و سەرۆك هۆزان و بەسەر کردنەوەی ڕێگەوبارنی بازرگانی نوێی لوستان بۆ هاتوچۆی کاروباری بازرگانی لینچ. خاتوو دووراند لە ڕێگەی دزفولەوە بە میانکۆدا هاتۆتە

لوڕستان و له خوڕەماوا و بروجێردەوە چۆتە تاران و باسێکی لەسەر ناوچەکە لە دەورەی ناسرەدین شادا نووسیوەتەوە.

هەروەك نووسیویەتی لە نەوامبری ساڵی ١٨٩٩ ز.داوەفدەکە لە دزفولەوە دەچێتە لوڕستان. لە پێشدا خاوەندەسەڵاتی خوزستان دووکەس لە ڕدێن سپیانی دێرکۆوەند بە ناوەکانی میرحاجی و میرمەتە بۆ شارەزایی ڕێگە ڕەوانە دەکات. ئەو دووکەسە هەرلە هەوەڵی کارەوە بە تەما دەبن زەبری خۆیان لە موتیمۆر وەزیر موختاری ئینگلیز بوەشێنن بە تۆڵەی کوژرانی کەسێکی خۆیان کە بەدەستی یەکێ لە خانەکانی دراوسێ کوژراوە، بەڵام هیچیان بۆ ناکرێت.

هەروەك خاتوو دووراند باس دەکات کاروانچی وای بەباش زانی بەقسەی شارەزای ڕێگەبەکەن و بەکۆمەڵ بە ڕێگەدا بڕۆن و بڵاو نەبن، ئاوا مەترسیی ڕێگە کەمترە. ئێوارێ لە نێزیك قەڵای ڕەزە دەمێننەوە و بەیانی دەچنە موڵکی سەگوەندان. خاتوونی وەزیر موختار دەڵێ سەگوەندان تووڕە و گوڕنەن، لە جلوبەرگدا تەواو پۆشتە و سەرنجڕاکێش و زۆرتر پۆشاکیان ڕەشە کەم واهەیە چەك بەدەست نەبن، پرچی ئافرەتیان شۆڕە و بە دوولادا شانەی دەکەن، جلەکانیان شینی تۆخە و لە بەرۆکەوە کراوەیە، ئافرەتی جوانیان تێدایە. دیسان دەنووسێ: "سەرۆکی تایەفەی سەگوەندەکاتن ٢٤ کوڕی ئازای هەیە لەگەڵ کوڕەکانی خەریکی ڕاپەڕاندنی کاروباری خۆیەتی". هەڵبەت ئەوە جێی سەر سووڕمان نییە لە کاتێکدا شێخ عەلی میرزا نۆیەم کوڕی فەتەلیشا، کە خاوەنی ٦٠ کوڕبووە و بەرلەوەی خۆی بمرێت زۆریەك لە کوڕەکانی ماڵاوایان لەم جیهانە کردووە.

خاتوو دووراند سەبارەت بە مێەرعەلی خان سەرۆکی ئەو کاتی تایەفەی سەگوەندان دەڵێ پیاوێکی قەڵافەت داری جوانچاك و خۆش ڕوخسار بوو، جلوبەرگی جوانی دەبەر دەکرد، زۆر بە زیپکوزاکوون بوو، تێگەیشتوو و پێگەیشتوو بوو. بەم گشتە شان و باهۆیەوە چەند کەسێکی تایەفەکەی دوو هێستر بەبارەوە دەڕفێنن و چاودێرانی شاندەکە دوای ئەوەی دەکەونە شوێن دزان، هێستری بەبێ بار دەهێننەوە.

شاندەکە شەو لە تەنیشت ڕووباری کەرخە و لە بناری کەبیرە چیا لە نێزیك پردی تەنگ خێوەت هەڵ ئەدەن. لێرەوە بەڵەدەکاتن پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کاروان لە ملەی کیالانەوە تێپەڕێت بە گفتی ئەوان وەختێ بیرانوەندان لەوان بەهێزترن واتە لە

سەگوەندان، بە هیچ و خۆڕایی ملی خۆیان بە شکاندن نەدەن، بەڵام شاندەکە بەخۆی و بە ٦٠ چەکدارەوە ناوێرێ خۆ لە قەرەی کیالان بدات و مەرزەم نابێت. پێیان خۆش دەبێ بە ڕێگەی توجارەتیدا سەفەر بکەن. مێەرعەلی خان بە وەفدەکە دەڵێ بیرانوەندان لەو ناوەدا هەن و دوور نییە کاروانەکە ڕووت بکەن" ئەو هەواڵ بۆ موتیمۆر دووراند دەنێرێ بە هۆی ئەوەی بیرانوەندان دووبەرامبەری سەگوەندانن نایەوێ لەگەڵیان شەڕی خۆ تڕێن بکات. شاندەکە لە یارمەتیدانی سەگوەندان بێ هیوا دەبن، بە مەجبووری بە ڕێگەی کیالاندا درێژە بە سەفەری خۆیان ئەدەن.

خاتوو دووراند باسی سەفەرەکەی دەنووسێتەوە چۆن بە کەلی کیالاندا ڕۆیشتوون، شەوێ لە شوێنێك بەناوی "سەر ئەشکەوت" لە سەرەتای ڕێگەی میانکۆ وچان دەگرن، چاوی بە لوڕەکان دەکەوێ هەموو چەکی مارتینی و بلژیکی و ئوسترالیایی بەدەستەوە، دوو ڕیز فیشەکیان لەسەر پشتێن بەستووە و فیشەك بە دیاری وەردەگرن و لە لای ئەوان خەڵاتێکی مەزنیە. بە بڕوای ئەو سێ شت لە لوڕستان زۆر بەنرخە: چەکی گەرم، چەقۆ و دووربینی دووچاو، هەروەك ئەو دەڵێ لوڕەکان ئەو شتەیان خۆش دەوێ بە کاری ڕاو و شەڕ بێت.

وەڤدەکە بە سلامەتی بە ملەی دلیچ و ئەفرینە دا دەگەنە خوڕەماوا. دوای ئەوەی دەگەنە شار ڕۆژێك بۆ حەسانەوە وچان دەگرن، تاکو تێشووی سەفەر ئامادە بکەن. لەو کاتەدا زەفەرومولك برای میرزا موحسێن خانی موزەفەرومولك، چەند لاپەڕە پێشتر لە کاتی هاتنی زەڵلەسوڵتان بۆلوڕستان باسمان کرد، نایبوحکوومەی خوڕەماوا بوو. خاتوو دووراند دەنووسێ دەسەڵاتداری سەرتا سەری لوڕستان و خوزستان عەینودەولە یەکێ لە خزمانی شایە. نایبوحکوومە وەزیر موختار بانگهێشت دەکات لەگەڵ شاندەکەی میوانی هۆردوویی ئەو بن لە دەرەوەی شار، بە هۆی دووریەوە ئەو میواندارییە سەری نەگرت.

خاتوو دووراند دەنووسێ: "نایبوحکوومەی خوڕەماوا نوێنەرێکی لەو شارە داناوە دکتۆرە و خەڵکی کوردستانە" ئەو ماوەیەك لەوە پێش بووە بە مەسیحی، هیچ کەس لەگەڵی ناکۆك نییە، شاندی ئاینی ئەمەریکا، دانیشتووی هەمەدان بۆ درێژەدانی خوێندنی پزیشکی ڕەوانەی لەندەنیان کرد و ئێستەش لە خوڕەماوا گیرساوەتەوە. دووراند لە نووسراوەکەیدا دەڵێ: ئەو شارە لە کۆندا میرنشینی ئەتابەکانی لوڕ بووە،

شارێکی خۆش دیمەنە و دەکرێ ناوچەیەکی پڕداهات بێت بەڵام بە بۆنەی چەتەیی لوڕانەوە گاسنێ بەزەویدا ناهێنن.

بەڵەدانی دێرکۆوەندی لە خورەماوا لە بری پارە خەڵاتی خۆیان تفەنگ وەردەگرن و دەگەڕێنەوە. خاتوو دووراند دەڵێ پێشتر پێیان گوتین لوڕان دەهۆباز و تالانچین، لەوانەیە هەر ئەو بەڵەدانە بەخاتری پارە بمان کوژن، بەڵام ئەوەی من لەو لوڕانە دیتم تەنیا دلۆڤانی و لەخۆبوردیی بوو.

سەرەنجام بڕیار ئەدەن لە خورەماوا بچنە دەرێ. عەینەدەولە دەسەڵاتداری لوڕستان و خوزستان بە گشتی نایبوحکوومەی خورەماوا لەگەڵ شارەزایان و میر و بەگلەران بۆ ڕەوانەکردنی سێرمورتیمۆر ڕەگەڵیان دەکەون. دەستەکە شەوێ لە زاخە چەند چارداخێکی بە قوڕ دروست کراوی لێدەبێت لە نێزیك تەپۆڵکەکان دەمێننەوە. خاتوو دووراند لە دەست سەرمای ئەو شوێنە دەبۆڵێنێت. لە ڕازان دەبنە میوانی خانێکی لوڕ، خواردنی بەیانی پلاو لەگەڵ گۆشتی کەو بۆ میوانان دادەنێن. دەنووسێ ئەو لوڕانەی واز لە ڕەوەندی و هەواران دەهێنن و دەبنە گوندنشین، لوڕانی کۆچەر لۆمەیان دەکەن و تیر و تانووتیان تێ دەگرن. دووراند باوەڕی وایە لوڕەکان لەچاو هۆزی بەختیاری لەمەڕ گوزەرانی ژیان لەدوان" دەڵێ ۷۰۰۰۰ بنەماڵەن، نێزیکەی ٤۰۰۰۰۰ کەس دەبن.

بە نێزیك بوونەوە لە بروجێرد و دیتنی سیلاخۆری سەرنجڕاکێشی ئەوێ لەسەر سنووری چیانشینانی لوڕ و دەشتنشینەکانی دەوروبەر یاداشتەکانی تۆمار کردووە و شەوێ لە چالانچۆلان دەمێنێنەوە و بۆ سبەیدا دەمەو ئێوارە دەگەنە بروجێرد، بە ڕێزو حورمەتێکی زۆرەوە دەیانبەنە بینای دەوڵەتی لە باخێکی مەزندا، وەسبەینێرا بەبێ مەحتەل بوون بەرەو سوڵتاناوا وەڕێ دەکەون.

* * *

هێنری ساواج لاندوور، ئەویش یەکەم کەسێکە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا وەك گەشتیارێکی ئینگلیزی سەردانی ئێران ی کردووە، بەرهەمی سەیروسەفەری ئەو گەڕۆکە لە دوو بەرگدا لەچاپ دراوە بەناوی سەفەر بۆ وڵاتی ئێرەیی بردن، بەڵام هێشتا ئەم کتێبە نەکراوە بە فارسی. لاندوور لە ساڵی ۱۸٦٥ ز. لە فلورانس ـــ ی ئیتاڵیا هاتۆتە

دنیا و زۆرینەی تەمەنی ٥٩ ساڵەی خۆی لە سەیر وسەفەری وڵاتان بووە، سەردانی ئاسیا و ئەفریقا و ئوسترالیا و ئەمەریکای کردووە، لە سەفەری هەردیدا چۆتە کەلکەتە و چەند جێی ئێران گەڕاوە. ئەو گەڕۆکە بێجگە لە وەی شەیدای سەیر و سەفەر بوو، دەستڕەنگین بووە و وێنەی جوانی بەخامەی بەهێزی کێشاوەتەوە و سەفەرنامەی خۆی بەو دیمەنانە ڕازاندۆتەوە کە سەرنجیان ڕاکێشاوە، لە بابەتێکدا کە لەسەر لوڕستان ئەدوێ زۆرتر ئاماژە دەکات بە کاروباری بازرگانی. دەڵێ ناوچەی پشتکۆ و پێشکۆ نەوتی تێدایە. سەبارەت بە هەڵس و کەوتی بەرەبابی پشتکۆیان دەڵێ ئەوانە تاکو ڕادەیەك لاسار و کێوین، بۆئەوە نابێ پشتیان پێ ببەستی و متمانەیان پێ بکەی. کەمەکێك ئاژەڵداری دەکەن و سەرقاڵی گەنم و تووتن دەبن دار و درەختی میوەیان هەیە، ئەمانەش بەزەحمەت بەشی خۆیان دەکات.

لە مەڕ بەشی پێشکۆ دەنووسێ ئەو ناوچیە حەشاماتەکەی زۆرتر خێڵاتین و گەرمێن و کوێستان دەکەن. بەهۆی ئەوەی ناوچیەکی کوێستانییە کەش و هەوای گۆڕانی بەسەر دادێت و گەرمایی دەشتەکانی تاقەتپڕوکێنە، بەڵام چونکە کوێستانی تەواو لێڕەوارە هەواکەی زۆر خۆشە. گوتوویەتی دانەوێڵەی باش بەتایبەت برنج لەم بەشە بەرهەم دێت" دەستێکی باشیان لە پێگەیاندنی ئەسپدا هەیە و زۆرتر لە هەر شتێك بازرگانیکردنی چەك و تەقەمەنی لە پێشکۆ بەهەڕمێنە.



ئێرنێست هێرتسلفید (١٩٤٧- ١٨٧٩ )ز. خۆر هەڵاتناس و ئێرانناسی ئەڵمانی بە هۆی شارەزایی لە چەندین زماندا هۆگریەکی تەواوی هەبوو بە بەردەنووس و خەتی کەونارایی و مێژووی کۆنی ئێران و عێراق و هەروەها مێژووی موسڵمانان، هەروەك دکتۆر محەمەدی موعین ناوی دەهێنێ و ماوەیەکیش لێی نێزیك بووە و بەیەکەوە خەریکی ڕاڤەکاری بوون، کەسێکی سەیرو سەمەرەی سەردەمی خۆی بووە. هێر تسفلید سەبارەت بە مێژوو، زمان و ئاییەنکانی ئێرانی، کلدانی، عیلامی کۆن و ئیسلام وتار و بابەت و کتێب گەلی زۆری لە پاش بەجێ ماوە. ڕەمز و ڕازی کەتیبە و نووسراوەکانی

سەر بەرد و کاشی تەختی جەمشیدی خوێندۆتەوە و لە فیروزاوا و دەوروبەری کازرون تەتەڵە و کەتیبەی پێشونیانی دۆزیوەتەوە.

هێر تسفلید لە دوا ساتەکانی دەورەی قاجاریە بە ڕێگەی بەغداو قەسری شیرین دا هاتۆتە خۆرئاوای ئێران و بە ناوچەی پشتکۆدا گەڕاوە و لەوێوە سەردانی مەڵبەندی سەمیرەی کردووە بۆ ئەوەی زۆتر خەریکی لێکۆڵینەوەکانی ببێت لە وڵاتی کەونی عیلام و دواتر بچێتە دەڤەری فارس. یادشتەکانی خۆی لە ساڵی ١٩٠٧ ز. بە زمانی ئەڵمانی و لەژێر ناوی سەفەرێك بۆ ناوچەی لوڕستان، خوزستان و فارس لە بەرلین چاپ و بڵاو کردۆتەوە.

گەلۆ، لە دەورەی والی گەری غوەلاّم ڕەزاخان دا هاتۆتە پشێکۆ، وەختیٚ لە زارنا دەبیستیٚ والی ٢٠٠٠٠ چەکداری لە کاس و کاری خۆی کۆ کردۆتەوە (ئەوانە بەتابەفەی عەمەلە ناویان دەبردن) بۆشەڕ لەگەڵ کوڕە مەزنکەی لە پشتکۆ چوونەتە دەریٚ و گەیشتوونە ئەمیراوا لەنێوان حوسێنییە و دزفولدا. هێر تسفلید دەنووسیٚ: لێرەدا مەجبور بووم سەفەری ئەمیراوا و دیتنی والی پەك بخەم و بەبیٚ کۆمەك و یارمەتیی والی بە دۆڵی سەمیرەدا درێژە بە سەفەرەکەم بدەم.

ئەم گەشتیارە بۆگەیشتن بە دۆڵی سەمیرە سەرەتا دێتە ئاسماناوا. لەو مەودایەدا چاوی بە کانی و ئاوێکی زۆر دەکەوێت و کێڵگەی گەنمەشامی و برنج دەبینیٚ و ڕووەکی شیرین بەلەك سەرنجی دەڕفێنیٚ و ئەم بەشە بە جێیەکی باش دەزانیٚ بۆ وەرزێڕی، لە ئاسماناوا باسی پاش ماوەی ئاسەواری دەورەی ساسانیان دەکات و باوەڕی وایە ئەو ناوچەیە دەوڵەمەندە بە ئاسەواری زۆر لەوە کۆنتریش. لە درێژەی ڕێگەدا دەگاتە ئاوایی کارزان، دەڵیٚ گوندێکی مەزنە و بنکەی غوەلاّم حوسێن خانی نوێنەری والییە، هەرچەندە غوەلاّم حوسێن خانی هەواڵی هاتنی ئەمنی زانیبوو کەسێکی نەناردە پێشوازم، ئەم کارە پێچەوانەی ئاکاری مرۆڤی مەزنە لە ناوچەکەدا، هەر بۆیە لەو گوندە لام نەداو درێژەم دا بەسەفەری خۆم.

هێرتسفلید وردە وردە دەگاتە ناوچەی لوڕەکانی مەلەکشایی. لەسەر وێك چوونی ئاسەواری زەنگوان و شیروان دەنووسیٚ و باوەڕی وایە لوڕەکانی مەلەکشایی ناوی خۆیان لە مەلەکشایی سەلجوقی وەرگرتبێت. هەندێك لەسەر ڕواڵەتی مەلەکشاییان دەکەوێتە گومانەوە. دەنووسیٚ ئەوان بەژن زراڤ و قەلاّفتدار و سەر و پرچیان قەترانی و ساف و ڕدێن شۆڕن" پێشە سەریان ئەتاشن و لاجانگ و بناگوێیان بە درێژی دەهێڵنەوە.

جلوبەرگیان تا بڵێی هەراوە. هەموویان کەپەنکی قۆڵ هەراو دەدەن بەسەر شاندا. کەپەنکی چوار گۆشەیان قۆڵی نییە و تەنیا لە پێشەوە دەکرێتەوە و ڕەنگی زەرد و سپی و سوور و ڕەشیان هەیە. بەختیارییەکان کڵاوی تەپڵەی سپی دەکەنە سەریان، بەڵام لوڕانی مەلەکشایی تەپلەی ڕەش دەنێنە سەر. کڵاوی مەزن پیاو و مەزنە میران مەزنترە لە کڵاوی خەڵکی ئاسایی. دیسا دەنووسێ: هەرچیم کرد نەمتوانی لەو هزر و خەیاڵە دوور بکەومەوە، کڵاوی مەلەکشاییان زۆرتر وەك ئەو کڵاوی باڵۆنی دەچێ و کەوا پاشاکانی ساسانی لەسەریان ناوە. بەخۆم نەبوو خەیاڵ بۆ ئەوێ زەمانێ هەڵی دەگرتم. لوڕانی کەلەکشایی دەسرۆکە یان پێچێك لەسەر کڵاوەکەوە لە دەوری سەریان دەبەستن و کاڵەی دەستچنی خۆیان دەکەنە پێ، تا بڵێی قایم و بە کار هاتووە، ئەمەش بەڕاستی سەرنجی ئەورووپیەکانی دانیشتوویی ئێرانی ڕاکێشاوە. مەلەکشاییان هەر هەموویان گورز و گاڵۆکێکیان بەدەستەوەیە و ئەمەش لە سەختە دارە و لە ڕەگی درەختان دەیبڕن و لە خەنەی دەگرن. زۆرینەی پێداویستی ژیانی خۆیان دەست کردە، ژیان و کولتووری ئەوان زۆر لە ژیان و گوزەرانی ئەو دەستە لوڕەی پشتکۆیان وا لە ناوچەی عێراق خەریکی کۆڵبەرین باش تر و لە پێشترە. زۆرینەی خواردنەکەیان گەنمەشامی و بەڕوویی کاڵە دەیکەن بەنان. لێرەدا هاوڕێ عوسمانییەکەم ئەفسەرێك بوو لەگەڵ کاروان، پێی وتم بڕێك لە تایەفە کوردەکاتن دەناسم هیچ وەختێ نان ناکەن.

هێرتسفلید لە مەودای سەفەریدا لە دۆڵی سەمیرە لە هێندمیل دەگاتە ڕەشماڵەکانی جەهانباخ کوڕی غوەڵام حوسێن، هەرئەوەی چەند دێر لە سەرەوە گلەیی لێکردبوو کەوا پێشوازیی لێ نەکردووە. لێرەشدا بە دڵمەندی باسی کوڕەکەی دەکات، بەزۆر کاروانەکەی پێ ڕاگرتووە و داوای بڕە پارەیەکی لێکردووە بە ناوی ڕێگەداریەوە. لە هێندمیل باسی گۆڕستانێك دەکات، شێرە بەردینە لەسەر گۆڕە کان نووستوو یان بە پێوەیە. هەروەها وێنەی مرۆڤ، سوار، گورز و گۆپاڵ، تیر و کەوان، شانە و مقەستی و شاڵی چاو پێکەوتووە.

لە دۆڵی سەمیرە دەگاتە گوندی میر سەی محەمەدخان، بە هۆی ڕدێنی ڕەش و درێژیەوە زۆر بەناوبانگ بووە و بە هێرتسفلید دەڵێ دەتوانێ نێزیکەی ٢٠٠٠ تفەنگ بۆ شەڕکردن ئامادە بکات و لە ڕابردوودا لەگەڵ حوسێن خانی والیی پشتکۆ بەشەڕ هاتووە.

هێرتسفلید دەنووسێ: لەوماوەیەدا من لەوێ جێگیر بووم شازادە فەرمانبەرما قۆشەن و هێزی خۆی بە دژی لوڕەکانی دێرکۆوەند لە جایدەر دامەزراندبوو بۆ ئەوەی کۆتایی بێنێ بە چەتەیی و دزیکردنی ئەوان لە ناوچەکەدا. ناچاریان بکات ماڵیات بدەن و ڕێگە و بانەکان لە جەردە و گۆران پاك ببێتەوە. هەڵبەت شازادە بە تەوای نەگەیشتبووە قووڵایی سەمیرە لەبەرئەوەی ئەو مەڵبەندە لەژێر دەسەڵاتی ئەودا نەبوو. هێر تسفلید نووسیویەتی من توانیم تاڕادەیەکی باش لەگەڵ خانەکانی ئەو دەڤەرە ببمە دۆست و جێی بڕوا، زۆریەك لەو چەك و دووربین و نامانەی دومۆرگان سەرۆکی شاندی ئاسەوارناسی فەرەنسە وەختی خۆی لە ئێران پێی دابوون چاوم پێیان بکەوێت.

لەمەر شاری سەمیرە و دەڕەشار ئاوا دەنووسێ: هیمی ئەو شارە دەگەڕێتەوە بۆ دەورەی ساسانیان. بە سەرسووڕمانەوە دەڵێ چما دانیشتوانی دەڕەشار و سەمیرە لەسەر دەمی ساسانیدا ئەو هەمووە ئاوەدانی و ژیارەی پێوە دیاربووە بەجێی ئەوەی لەدنیایی ئەمڕۆدا بۆ جیهانیان ببێتە وێردی سەرزمان بۆ پاشەوە گەڕاوەتەوە و وازیان لە ژیانی باژێرنشینی هێناوە و بوونەتە خێڵەکی و گەرمێن و کوێستان دەکەن. هەرخۆی وەڵام دەداتەوە و دەڵێ دوور نییە تەیموری لەنگ لەشکری هێنابێتە ئەم ناوچەیە، شارەکانی وێران کردبێ و خەڵکەکەی بە دەردی فەلەستینیانی ئەمڕۆژی بردبێت.

لەو ماوەیەدا لە دەڕەشار دەمێنێتەوە، باس لە مەحمودخان ناوێك دەکات کەیخوای ملّبەندەکە بووە و هەشت سواری بەچەکەوە بە سەرۆکایەتیی کوڕەکەی بۆ بەڕێکردنی لەگەڵ دەنێرێ تاکو کاروانەکەی لە دەربازگەی چیای کەبیرە بپەڕێنێتەوە" هێرتسفلید لە بناری چیای کەبیرە بۆ ئەمنییەتی ڕێگە خەڵکێکی زۆر بەکرێ دەگرێت. ئاواش کاروانەکە دەکەوێتە بە پەلاماری ڕێگران" هێرتسفلید لە درێژەدا دەڵێ تالانچیان وەختێ زانیان دار و دەستەی ئێمە لە ەی ئەوان زۆرترە کشانەوە و کەسیش لەو نێوەدا بریندار نەبوو، بەڵام ئەو کەشە هێمنەی پێشتر ئالۆزیی تێکەوت و منیش زۆر لە مەحمودخان بەگومان و دڕدۆنگ بووم. بۆ ئەوەی ڕۆژێك پێشتر بەزۆری تەمای وابوو چەکم بکات بەڵان من خۆم بەدەستەوە نەدا. هەستم دەکرد بە ئەنقەست لەم بارودۆخە بهەیوا بوو ئامانجی خۆی بپێکێ نەك لە خێوەتەکەی خۆیدا ڕووتمان بکات. دیسان دەنووسێ لەو ڕەوەز و هەڵەموتە ئەسپێك بەبارەوە بەر بۆوە وەك باڵندە بە حەواوە دەسووڕایەوە،

کەچی وەختێ گەیشتە خوارێ هەستاوە و چەند هەنگاوێك ڕۆیشت و کەوت بە عەرزیدا و تۆپی. گەشتیارەکە دەنووسێ دوای ڕووداوی تەقەلێکردنەکە، بە شێوەی سەربازی بە دەمامکی عەسکەری جووڵەمان کرد تاکو لە ناوچەی پڕ لە مەترسی پشتکۆ چووینە دەرێ و چەند ڕۆژ دواتر لە دەربازگەی ئاودانان و ناوچەی ئاوەدانی سەگوەندان خۆمان گەیاندە دزفول و لە دەڤەری پڕ مەترسیی لوڕستان چووینەدەرێ و ڕزگارمان بوو.



جێی خۆیەتی لەو سەیروسەفەرەماندا پوزلوخ و گۆرەوی بەن و کەوش و کاڵەمان هەڵکێشین و کەپەنك و فەرەنجیمان بدەین بە شاندا، هاو سەفەر بین لەگەڵ گەشتیاری ئەم جارەمان کە ئەویش گەڕۆکێکی ئەڵمانییە و لە دەیەی سەرەتای سەدەی بیستەمدا گەیشتۆتە ناوچەی لوڕستان. بائێمەش بێبەش نەبین لە زانیاری پوخت و بەپێزی. سەرەتا بابزانین هاوسەفەری ئەم جارەمان کێیە" هۆگۆگروتە جوگرافیزان و کۆمەڵناسی ئەڵمانی، هەروەك لاندوور سەردانی وڵاتانی ئاسیایی و ئەفریقایی و ئەمەریکای باشووری کردووە. ماوەیەکیش گۆڤاری "ژیاری ئەڵمانی لە جیهاندا" بلاو کردەوە.

گروتە لەساڵی ١٩٠٩ لە میزۆپۆتامیاوە کە لەو دەورەیەدا بەشێك بووە لە وڵاتی عوسمانی، لە ڕێگەی پشتکۆ وە کە ئەو دۆژگارە والی غوەلامرەزا خان یان دوایین والی لەو ناوچەیەدا گەیشتۆتە ئێران. ئەو لە پەڕتووکی خۆیدا بە ناوی سەفەرنامەی گروتە، سەرەتا دیمەنێك لە پشێونی لوڕستاندا دەدابە خوێنەرانی. سەرەتا باسی نێوان ناخۆشیی والی و دەوڵەتی عوسمانی دەکات لەسەر موڵکێك کە لە نێزیك بەدرە لە عێراقدا هەڵکەوتووە: دوای شەڕ و لێکدانێك والی توانیی سەد سەربازی عوسمانی بە دیل بگرێت، وەك بارمتە ڕەوانەی چیاکانی کردووە. لەو ڕووداوەدا "پەرتەوشا" خاوەن پلەی عوسمانی چەند هێزێك دەداتە پێش خۆی و بۆ شەڕکردن لەگەڵ والی. پاشان دێتە سەر باسی هەڵچوونی سالارە دەولەی کوڕی مزەفەرەدین شا و خەنیمی محەمەدعەلی شا، بۆ وەدەستهێنانی تاج و تەختی پاشایی. بەهۆی ئەوەی کچی غوەلامرەزاخانی والی پشتکۆیی ژنە، لە ناوچەی لوڕستان دەسەڵاتی باشی بەدەستەوەیە و توانیوەتی لە

خۆرئاوای ئێران بە گژ هێزی دەوڵەتیدا بچیٚ و سکەی زێڕین بە ناوی "سالارەدین پشتیوانی بیٚ ئەمیری موئمینین" لیٚداوە.

هەر بەم شێوەی گروتە لە سەفەرنامەکەیدا دەنووسیٚ لە بەغداوە بۆ مەندەلی نێزیکترین شارێکە لەژێر دەسەڵاتی عوسماندا بە پشتکۆوە لکاوە. نوێنەری والی لە مەندەلی هەواڵی پیٚ دەدات بۆ یارمەتیدانی هیچ فەرمانێکی وەرنەگرتووە، ئەمەش لە کاتێکدایە نوێنەری والی لە بەغدا بەڵێنی بە گروتە دابوو کەسێکی شارەزایی لە ئیختیار دەنیٚ. هەڵبەت خۆی باسی ئەوە دەکات باڵوێزخانەی ئاڵمان لە تاران لە ڕێگەی تەلەگرافەوە ئاگەداریان کردۆتەوە واز بێنیٚ لە سەفەری لوڕستان ناوچەکە جێی متمانە نییە، دەسەڵاتی ئێرانی ناتوانیٚ سەر و ماڵی ئەوبپارێزێت.

گروتە هەروەك مورتنسنی دانیمارکی لەمەو دوا باسی دەکەین، نووسیویەتی لوڕەکان باوەڕیان وایە هەروەختێك بیانییەك دێتە ناوچەکەیان بۆ ئەوەدێت دەسەلاتیان لیٚ بستێنیٚ و ئەو ئازادیەی هەیانە بیبڕن. هەر لەسەر ئەم بابەتە ئاماژە بە دووئموونە دەکاتن: بۆ وێنە ناوی شاندی ئینگلیزی دەهێنیٚ کە خەریکی نەخشەکێشانی ڕێگەی دزفول بۆ بروجێردن، لوڕەکان چەند ڕایەك هێرشیان کردوونە سەر و جارێك داگلاس خاوەن پلەی سەربازی و لوریمرقۆنسولی ئینگلیزی بریندار دەکەن و لە خاکی لوڕستان وەدەریان دەنێن. باسی بازرگانێکی سوئیسی دانیشتوویی بەغدا دەکات و دەڵیٚ قەرزێکی زۆری لەسەر والیی پشتکۆ دەبیٚ، والی قەرزەکەی دەنێتە مستی، بەلام ئەو بازرگانە بەو گشتە پارە و پووڵەوە بە حەیاتی ناگاتەوە خاکی بەغدا.

ئەمجاریش گروتە لە یاداشتەکانیدا دەنووسیٚ، وەختیٚ لە مەندەلی دوورکەوتینەوە و لە خاکی پشتکۆ نێزیك بووینەوە، لەبەرئەوەی لە خاکی عوسمانییەوە دەهاتین، دە دوازدە سوارێکی لوڕ بە تالۆکە بەرەو ڕوومان دەهاتن، کاتێك زانیان میوانی والین حورمەتی خۆیان نیشان داین. لەو مەودایەدا تا دەگاتە بنکەی والی چەند ژن و پیاوی لوڕ تێکەڵ بە قەتار و کاروانی ئەوان دەبێت، باسی بەژن و بالاٚ و جلوبەرگ و شەروالی کورت و گورز و گالۆکی ئەوان دەنووسێتەوە. هەر ئەو لوڕانە بۆی دەگێڕنەوە هەوارچیان لەسەر پووش و پار و لەوەڕگە بەشەڕ هاتوون و کوڕێکی جەحێڵ کوژراوە و تایەفەی کوژراوەکە داوای دووسەد تمەن خوێنبایی دەکەن، بەلام کەسوکاری بکوژەکە دەتوانن سەد تمەن

بدەن، ئێستەش دەچنە لای والی مەسڵەتیان بۆ بکات. نووسیویەتی سێ کەسی دیکەش بۆ کۆتایی هاتنی نێوان ناخۆشی دەچون بۆلای والی" گۆیا کوڕێك کچی بێوەژنێك مارە دەکات و قەول و قەراریان وا دەبێ چل تمەن مارەیی بدات بە دایکی بووکێ، هەڵبەت گروتە دەنووسێ بەم پارەیە کچە دەکڕێت، دیارە کڕین نەبووە و شیربایی بووە، بەڵام تاشەوی زاوایی کوڕە تەنیا بیست تمەن دەنێتە مستی دایکی کچەوە، دایکە لە شەوی زاواییدا هەمووشەوێ وەختی نووستن دەچێتە ڕەشماڵی زاواکەی و لە نێوانیاندا دەخەوێ. شەوێك بووك زاوا بەدزی دایکە بەیەك دەگەن. سا گروتە بەم چەشنە لە پەسنی بووکەخان ڕادەچێ: جلوبەرگی سووری بووکێنی دەبەردا بوو، ڕوخساری گەنمڕەگ، چاو و برۆڕەش، دەمولێو خونچەی گوڵ، لووتێکی نوقڵی. لەگەڵ مێرد و دایکی دادی خۆیان دەبردە لای والی.

لەنێو ڕێگەدا تووشی دەستەیەك زیارەت کەرانی مەشەد دەبێ کە دوای ٩ مانگ تازە دەگەڕانەوە شار و گوندی خۆیان. ئەوان وەختێ لە خوڕەماوا و بروجێرد دەچنە دەرێ بەبێ جیاوازی گلەیی لە بارودۆخی لوڕستان دەکەن. یەکێ لە دەست بەسەرداگرتنی گوێرێژەکەی، یەکی دیکە کیسەی پارەیان لێ دزیوە بیست تمەنی تێدابووە، ئەویتر ڕانەکەیان ڕاداوە و کەسێکی دیکە لەدەست گرانیی نان دەیناڵاند. سەرۆك کاروان خێراخێرا لوڕانی بۆ تاوانی ئیمام ڕەزا دەگێڕایەوە.

هۆگۆ گروتە پێش ئەوەی چاوی بە والی بکەوێ سەرەتا باسی پەیوەندی نێوان لوڕەکان و والی پشتکۆ دەکات و دەڵێ بەشێکی زۆری عەشیرەتی ڕەوەندی ئێران واتە یەك لە چوار بەشی خاڵکی وڵاتەکە لوڕن. ئەوان لەنێو چیاکانی هەمەدان تا شیرازدا دەژین. سروشتی ناوچەکە کاری کردۆتە سەر خدە و ئاکاری ئەوان. لوڕان مللەتێکی ساکار و بێ فڕوفێڵن، لەم وڵاتەدا گەرمێن و کوێستان دەکەن. ئەوەی بۆ ئەوان لە ناوچەکەدا بایەخی هەبێ، تفەنگی مارتینی ئینگلیزییە ئەمەش لەو مەڵبەندە زۆرە.

بە قەولی ئەو گەڕۆکە دەسەڵاتی ناوەندی نەیتوانیوە خەڵکی جەنگاوەر و سوارچاکی ئەم کوێستانانە بە چۆکدا بێنێ. هێوریان بکاتەوە. هەربۆیە پاشای مەملەکەت بەردەوام لەگەڵ سەرۆك هۆزان بە هێمنی دەجووڵێتەوە. خۆیان لێ نێزیك دەکاتەوە و پشکیان دەداتێ و باڵیان وەسەر دەکێشێت تاکو خۆیان لەگەڵ لوڕان ڕێك بخەن و ناوچەکە

دووربێت لە شەڕو ئاژاوە. لە کاتی پێویستدا حکوومەتی ناوەندی خەڵات و بەرات دەدا یەکێ لە دەوروبەری خانی سەرەڕۆ و لاسار بۆ سەر کوت و بە تاڵان بردنی هۆردوویی خان هانی دەدات. دەنووسێ تەنیا شارێك کە لە دەورەی تەیموورەوە مابێتەوە خوڕەماوایە، وەختێ هاتە سەر شارەکە هەزار لوڕی ئەسیر کرد و لەسەر زنارەکانەوە بەری دانەوە.

دەنووسێ، والیی پشتکۆ لە شێوەی ئەمیرانی سەدەکاتنی ناوەندی فەرمانڕەوای تەواوی موڵك وماڵی ئەوخەڵکەی بەدەستە" بەکەیفی خۆی ماڵیات و پیتاك دەستێنێ و سەردار و بەشداری ئەو خەڵکەیە. لەو ماڵیاتەی کە دەبێ لەساڵدا ٢٠٠٠٠ تمەن بدات بەدەوڵت، نیوەی بۆ خەرجی قۆشەن و چەکدارەکانی ولەهەمبەرهاتنە پێشی عوسمانییەکان ڕادەوەستێ.

سەروان مونسل لە ساڵی ١٨٨٨ ز. چاوی بە حوسێن قولیخانی والی پێشوو ناسراو بە ئەمیر تومان دەکەوێ، گوتوویەتی" والی هێندە ڕق ئەستوور و بێبەزە بووە پێیان گوتوە ئەبو قەڕارە (زالّم) دەنووسێ لەشکر و قۆشەنی والیی پشتکۆ بریتی بوو لە ٧٠٠ سوار و ٢٠٠٠ پیادە، تەواویان ئەوچەکانەیان بەدەستەوە بوو لە شەڕ لەگەڵ عوسمانیان دەستیان بەسەردا گرتبوو.

ئێستەش گەڕۆکی ئێمە خۆێ ئامادە کردووە بچێ و چاوی بە والی بکەوێت، بە گروتە دەڵێن بۆ بینینی والی جلوبەرگی جوان بکاتە بەری ئەویش بەقسەیان دەکات. لەژێر سەیوانی دارهەنارێك چاوی بە والی دەکەوێ بە جلکی عەسکەری و سەرشانەی ئاڵتوونییەوە لە تەنیشت حەوزێك لەسەر کورسی دانیشتووە. پۆلێك چەکدار هەرهەموویان بە قەتارەی ڕەخت و فیشەك بەندەوە، ڕیشی درێژ و قەفی سمێڵ لەبن گوێیان لە دەوری ڕاوەستاون. وەك لە نووسینەکەیدا دەردەکەوێت بە ئاشکرا والی حەز بە دیتنی هیچ کەسێکی بیانی ناکات پێ بنێتە ناوچەکەیەوە.

گروتە تاریفی ئەو مەڵبەندە دەکات و دەڵێ ئەم چیا و دارستانەی پشتکۆ وەك ئەڵمانی ئێمە جوان و دڵگیرە، بەم وتەیە والی خۆشحاڵ دەبێ و گوڵی ڕوخساری دەپشکوێ. غوەڵامرەزاخان بە شانازیەوە دەڵێ باب و باپیرانی چەند سەدە لەمەو بەر حوکمڕانی ئەم ناوچە بێ داهات و هەژارە بوون، بەڵام سەری لەوە سووڕ ماوە بۆچی

ئێرانی و تورکان پێیان وایە سەروەت و سامانێکی زۆر لەژێر چیاکانی پشتکۆدا خۆی حەشار داوە. دەڵێ لوڕانی دەوار نشین چاویان لە سەروەت و ژیانی شکۆدار نییە. ئەوەی ئەوان مەرزەم دەکاتن تفەنگی باشە و لەوەڕگەی کوێستانی. بە باوەڕی گروتە والی بەم شێوەیە ویستوویەتی تێی بگەیەنێت کە پشتکۆ هیچ پێشوازیەك ناکات لە کەلوپەلی بیانی و لێرە بە تەمای بازاڕ خۆشی نەبێ و ئەوان گەرەکیانە دوور لە چاوی بێگانان سەربەخۆ بژین.

گروتە تفەنگێکی پێنج تیری موزێر و دەمانچەیەکی گرانبایی پێش کەش بە والی دەکات. والی دەمودەست لە مەبەستی ئەوان تێدەگات و لەبەرئەوەی دەزانێ تفەنگێکی باشە قبووڵی دەکات و بەبێ مەحتەلبوون دەینێرێ بۆ کوڕە مەزنکەی خۆی بەناوی ئامانوڵڵاخانی یاسان، لەو کاتیدا دژ بە نەزەرعەلی خان سەرۆکی هۆزی تەرحان و کاکاوەند لەشەڕدا بوو، تاکو کەڵکی لێوەر بگرێت. گەشتیارە ئەڵمانییەکە دوو سەرباز لە والی وەردەگرێ بۆ ئەوەی بەبێ ترس لە پشتکۆ سەرقاڵی سەیروسەفەری خۆی بێت.

هۆگۆ گروتە، لە ماوەی چەند حەوتەیەکدا لە ناوچەکە خەریکی لێکۆڵینەوە و کاروباری کۆمەڵناسی دەبێت و ژیانی خەڵکی دەڤەرەکە دەخاتە ژێر وردیلە بینی ەزری خۆیەوە و یاداشتەکانی تۆمار دەکات. بە گشتی باسی خۆشگوزەرانی دەسەڵاتدارانی خان و ئاغاکان دەکاتن و چەوسانەوەی چینی هەژار و بێدەرەتانان دەداتە بەر نووکی خامە، چۆن ئەو خەڵکەیان بە نانی وشکی دەستبەسەر کردووە، هەربۆیە ئەوانیش مەجبوورن دەست بکەن بە جەردەیی و دزیکردن و بەرتیل لەمو لەو سەندن. ئەم دەردە پشتکۆی تەنیوەتەوە و ئەواش نەبێ لەبرسان دەمرن.

لێرەدا هەروەك نووسراوەکەی نیشانی داوە" هەموو ڕۆژێ بەیانی و ئێوارێ لەسەر ڕێی کانی لە ژن و کچانی لوڕ ڕادەمێنێ گۆزە بەشان لە کانی دێنەوە، هەموو کەڵەگەت و ناوقەد باریك جێ پەنجەی کوێرەوەری ڕۆژگار بە ڕوخساریانەوە دیارە، ژیانی بە ژان بەسەردا سەپاندووە. لەمەڕ جلکی ئەوانەوە ئاوا دەنووسێ: کراسی بەریان چیتی گونارە و دەگاتە سەر ئەژنۆیان" دەرپێیان تنگە و شینێکی تۆخە و لەسەر گوێزینگی لاقیان ڕاوەستاوە، ڕازاوە بە گولێنگی ڕەنگاوڕەنگ.

باوەڕی وایە لەو ناوچەیەدا تووشی زۆر تیرە و تایەفە دەبیٚ کە بە هەزاران ساڵ لەمەو بەر لەسەر ئەو خاکە ژیاون و بەرینانیان مردوون. بۆ وێنە تۆرەمەی "نگریتۆس" واتە پاشماوەی ئاسیای خۆرهەلاٚتی کە پێشتر لە ولاٚتی عیلام ژیاون، سپی پێستانی قەفقازی و هێند و ئەورووپایی بەرچاو دەکەوێت. دەسەلاٚتی دوور و درێژی ئاشووریان و بابلی و تێکەڵ بوونی بەردەوامی دانیشتوانی پشتکۆ لەگەڵ خەڵکی میزۆ پۆتامیا ڕەچەڵەکی سامی لە ناوچەکە خستۆتەوە، بەلاٚم زاڵبوونی سەرەکیی دەگێڕێتەوە بۆ ڕەگەزی هیند و ئەورووپایی. کەڵەگەت، ڕووخساری پێشە و ئێسقانی و کەللەسەری درێژ بە نیشانەی ئەم زاڵبوونە دادەنێت. دەڵیٚ ڕواڵەتی لوڕانی فەیلی دەگەڕێتەوە بۆ گەلی "هیتی" لە سەدەکاتنی بەرێدا لە ئاناتوولیی ئێستەدا ژیاون.

گروتە دەنووسیٚ لە ماوەی سەیروسەفەرمدا ئەوندەی لە پشتکۆ بووم زۆر جار لەنێزیکەوە لەگەڵ ئافرەتیان بەرەو ڕوو بووم، هەر هەموویان خاتوون و بە حورمەتن، زۆر بەناموس و نەفسبەرزن، قەتم نەدی ڕووم لیٚ وەرگێڕن. هەروەختیٚ لام دەدا ڕەشماڵی ماڵێك ژنی خاوەن ماڵ بەرەو پیرم دەهات و هەوساری ئەسپی لە دەست وەردەگرتم و بەبیٚ ئەوەی پیاوی لە ماڵ بێت میوانداریی لیٚ دەکردم. ڕفتاریان لەگەڵ میوان و غەریبە وەك دایك وایە.

گروتە ئەڵیٚ" کاتێك بۆ دیتنی دۆڵی شیروان لەگەڵ یەکیٚ لە پیاوەکانی والی دەڕوات کابرای تاین بیٚ ئەوەی بۆی گرینگ بێت ئەوە کێیە" پێی دەڵیٚ تۆ سیخوڕی سیٚ قۆڵی! بۆ تورکان و ئێران و بۆ خۆت سیخوڕی دەکەیت و پارەی باش وەردەگری.

لەشوێنێکی دیکەدا نووسیویەتی" لوڕانی شیروان وەك لوڕی مڕومۆچی پشتکۆ نین، ئەمانە زۆر لەگەڵ غەریبە سازگار و گەرموگوڕن. چەند ماڵ لەژێر ڕەشماڵێکدا بەیەکەوە دەژین و تەنیا خێوەتێکیان جویٚ کردۆتەوە و بەرەیان تێدا داخستووە.

گەشتیارە ئەڵمانییەکە دوای چەند حەوتە سەیر و سەفەر ئەوسا بەنیازی جێیەکی دیکە بار و بنەی خۆی دەپێچێتەوە. ئێستەش لەو ماوەیەدا باری سەفەری کەم کردۆتەوە، ئەو کیسانەی سیٚ هەزار سکەی یەکقڕانی و دووقڕانی ئێرانی و سکەگەلێکی "مەجیدیە"ی عوسمانیی تێدا بوو تەواو کردووە هەروەك خۆی دەڵیٚ""بۆ ئەوەی بتوانیٚ شان و شکۆی میوانێکی مەزنی ئێرانی بپارێزێت."

بۆ ماڵ ئاوایی کردن دەچێتە لای غوەڵامرەزاخانی والی. لە دیوانی ئەودا گوێ بیست دەبێت ڕاپەڕینی شازادە سالارە دەولەلەهەمبەرمحەمەدعەلی شادا سەر کەوتوو نەبووە و ئەو خەونەی وەدی نەهات کە بەتەما بوو لوڕستانێکی مەزن لەژێر ئالایی خۆیدا کۆبکاتەوە. لەو نێوەدا بابی ژنەکانی واتە والی و داوودخان، سەرۆکی عێلی کەڵەوڕ پشتیوانیان لێ نەکردووە. لە کۆتایدا هۆگۆ گروتە هاوڕێ لەگەڵ سی سواری غوەڵامرەزاخانی والی کە لە دەورەی دەسەڵاتی ڕەزاشادا لە ئێران ڕایی کرد و خۆی گەیاندە بەغدا و هەر لەوێ سەری نایەوە" پشتکۆ بەجێ دەهێڵێ و دەچێتە کرماشان.



سیسیل جان ئیدموندز لە لایەن ئینگلیزەوە ڕەوانەی ئێران دەکرێت، زۆرتر ئەرکی بەردەستی و کەفالەتی لە ئەستۆ بوو. ئەو گەشتیارە لە ساڵی ۱۹۱۲ تا ۱۹۲۱ ز.دا تێکەڵ بە کاری تایبەت دەبێ لە ئێران. ماوەیەك سەرپەرشتی کۆنسولگەریی ئینگلستان دەبێ لە ئەهواز، دوایین ئەرکێك کە لە ئێران لە ئەستۆی بوو ئەفسەری رامیاریی هێزی زێرەڤانیی ئینگلیز بوو لە باکووری خورئاوای ئێران.

ئەدمۆندز لە ساڵی ۱۸۸۹ هاتە دنیا، خوێندنی لە کەمبریج تەواو کرد. وەختێ هاتە ئێران بەینێك بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری سیاسی لە شاری دزفول گیرسایەوە. هەر لەو سەر و بەندەدا بوو دەستی کرد بە سەیروسەفەر لە لوڕستان و بروجێرد، بۆ کۆکردنەوەی زانیاری رامیاری و سەربازی. سەبارەت بە لوڕستان دوو پەڕتووکی نووسیوە: یە کیان یاداشتەکانی لوڕستان و ئەوی دیکە لوڕستان: پێشکۆ و باڵاگریوە. ئەم گەڕۆکە چۆن خراپە ئاواباسی لوڕەکانی کردووە. ڕەنگە ماوەیەك لە خوڕەماوا لەژێر چاودێریدا بووبێت هەر بۆیە ناقایل بووە. دوو کەس باسی ئەو گەڕۆکە دەکەن کە دەستبەسەر بووە، بەڵان چۆنێتی و وردەکاتریپەکانی ناخەنە ڕوو، سەرەتا گاریل ئاڵفونس، لە کتێبەکەی خۆیدا لەژێر ناوی لێکۆڵینەوەی جوگرافیایی لەسەر ئێران نووسیویەتی: "ئەدمۆندز ماوەیەك لە خوڕەماوا وەك دیلێك دەست بەسەر دەبێت و لە پاش چەند مانگ توانی لە لوڕستان هەڵ بێت بچێتە کرماشان." دووەم کەس مورتنسنی دانیمارکی، لە کتێبی هەوارچیانی لوڕستان دا ئاماژە دەکاتە سەر ئەو بابەتە.

بێگومان هۆیەکی ئەم زمان شڕیە لەمەڕ لوڕانەوە دەبێ بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ئەدمۆندز بۆ دەرچوونی کەلوپەلی کۆمپانی ئینگلیزی لینچ لەگەڵ چەند خانێکی لوڕ وتوویژ دەکات و ئەوان مەرزەم دەبن ئەوکاروانە کە مەزندەی هەڵگری کەلوپەلی ئینگلزیە و تایبەتە بە برایانی لینچ بەبێ مەترسی بە ڕێگەی لوڕستاندا بچێتەدەرێ، بەڵام لوڕان لە نێوان میان کۆ و باڵاگریوەدا بۆسەی بۆ دادەنێن و ئەو کاروانە دەوڵەمەندە بە تالان دەبەن. بە وتەی ئامانولاّیی ئەو ڕووداوە ئەوندە گرینگ بووە لوڕەکان کردوویانە بە ڕووداوێکی مێژوویی و ناویان ناوە "ساڵی لینچ." جیاواز لەو ڕووداوەی باسمان کرد، لووت بەرزی و دەمارگرژی ئەوسای ئینگلستان و زەبوونی دەسەڵاتی ئێران لە دوا ساتەکانی تەمەنی یەکبەدوای یەکی قاجارییەکان و هەژاری و دواکەوتەیی خەڵکی ئێران و بە تایبەت ناوچەی لوڕستان بەگشتی، ئەوجار دەزانین تووڕەیی کەسگەلێکی وەك ئەدمۆندز لەچی دایە و بۆچی مەستی بادەی خۆ لێ گۆڕان و چاو سوورکردنەوە بوون. ئەویش کاتێك کە خەڵکی ڕووت و برسی دەستەوداوێنی ئەوان بووە.

هەروەها ئەدمۆندز ساڵی ١٩١٧ ز. هاوکات لەگەڵ دەسەڵاتی ئەحمەدشادا، جارێك لە دزفولەوە دەچێتە مەنگرە و سەردانی تایەفەی میر دەکات و دەگەڕێتەوە دزفول، سێ مانگ دواتر هەمدیسان دەچێتەوە دزفول و دەورێکی خوڕەماوا و بروجێرد لێ دەدا. وێدەچێ لە بروجێردەوە گەڕابێتەوە خوڕەماوا، هەر لەو کاتەدا کەوتۆتە ژێر چاودێری و لەو شارەوە چۆتە کرماشان.

با ئێستەش وەگەڕێین بۆ یەکەم سەفەری ئەدمۆندز وەختێ چۆتە ناوچەی مەنگرە و میان میران. هەروەك لە نووسراوەکەی خۆیدا دەردەکەوێ پێش ئەوەی بچێتە لای میرەکان سەرەتا چەند بارمتەیەك لە ماڵباتی ناودارانی میر لە دزفول لەلای گل دەداتەوە بۆ ئەوەی گیانی نەکەوێتە بەر مەترسی. لەگەڵ مێەرعەلی خانی سەگوەند کە پێشتر لە سەفەرنامەی خاتوو دووراند چەند لاپەڕە پێشتر باسمان کرد بۆ ئەوەی چاوی بە ڕەشماڵانی داراب خان بکەوێت لە ساڵحاوا یان ئەندیمشکی ئێستە سەفەر دەکات. سەرەتا باسی شێوەی کڕنۆش بردنی یەکێ لە خانەکانی میرعالی خانی، لە بەرەبابی تایەفەی میر، دەکات، کە چۆن هەر دوو دەستی لەسەر نێوکی داناوە و کڕنۆشی بۆبردووە. باسی هاوڕێیەکی دەکات و دەنووسێ کاتێك کوێخایانی میرزاوەند لە تایەفەی قەلاوند بۆیەکەم

جار دەچنە دزفوول تووشی شڵەژان و سەرسوورمان دەبن و بە دیتنی شار بستێك دەمیان دەکرێتەوە و بە زرم و کوتی کوتکی ئاسنگەران وا دەزانن کەونوونەتە چاڵی جهەندەم.

ئەدمۆندز لە چەند گوندێك میوان دەبێ و زۆر بە گەرمی میوانداریی لێ دەکەن. جلوبەرگی لوڕی و عەبادەکاتە بەری، کڵاوی لبادی دەکاتە سەری. وەك دەردەکەوێ میر سالار ناوێك چاوساخی ئەو وەئەستۆ دەگرێ و میر لەتیف ناوێك ئێرەیی پێ دەبات و بە دڵمەندی بە نوێنەریی ئینگلیز دەڵێ هاتۆتە پێشوازی و بۆ نیوەڕۆ خوانێك میوانداری لێکردووە. میر سالار ڕدێنە سپییەکەی خۆی دەگرێ و دەڵێ" ئەو باوە حیزە کێیە وا کونسولی ئینگلیز لەبەر ئەو چاوپێکەوتنەکەی دوا دەخات و. بە تووڕەییەوە دەفتەرۆکی یاداشتی ئەدمۆندز ـ ی گرتووە و گوتوویەتی" بەم کەلامی خوایە تۆڵە دەکاتەوە. ئێستەش بە وردی لەم دیمەنە ڕامێنە چۆن لەسەر میوانداریکردنی گەڕۆکی ئینگلیزی دڵمەندی هاتۆتە ئاراوە. کەچی ئەدمۆندز چەند لاپەڕە ئەولاتر دەبێژێ خزمەت کارە لوڕەکەم وەك "سیسارکە کەچەڵە" داوای خەڵات و بەرانی زیاتری لێ دەکردم و دەمی لە جەرگم نابوو.

لێرەدا باسی تەماح و چاوە چڵەی میرەکان دەکات دەڵێ لێیان پرسیم ئاخۆم پیاوانی ئەو لەندەنەی ئێوە ناچارن وەك ئێمە ٤٠٠ تمەن مارەیی بدەن بە ژنەکانیان؟ کاتێك لە بەرسڤی ئەواندا گوتم پیاوانی ئینگلیزی لە وەختی زەماوەند دا چاوەڕێی ئەوەن ٤٠٠ تمەن دیاری لە خێزانیان وەربگرن هەر هەموویان ئافەرینیان بە زماندا هات و بە گرێی قامکەکانیان حیسابیان دەکرد ئەگەر کەسێك چوار ژن بێنێ ٢٠٠٠ تمەن دێتە گیرفانییەوە. باسی گۆرانی لوڕی دەکات و دەڵێ میرەکان بۆ بیرەوەری " قەدەم خێری ناودار و نازداری کچی کوێخا قەندی" سترانی بەسۆزیان دەگوت و تەزووی خۆشی بە دڵ دەبەخشی.

ئەدمۆندز دەڵێ میرەکانی دێکۆوەند باوەڕیان وایە بەرەچەڵەك دەچنەوە سەر شاوێردیخان دوایین ئەتابەکی لوڕستان، وەختێ لافاوی شاهەباسی سەفەوی گەیشتە سەریان هەموویانی ڕاماڵی. دەڵێ ڕێگەی شاوێردیخانەوە دەچنەوە سەر کوڕە مامی پیامبەر. بەکورتی باسی بەرە بابی میرەکان دەکات و دواتر خەریتەی مەمگرە دەگرێ، کە ڕووداو نووسانی رووسی ئەو ناوچەیە بە "گڵکۆی سامناك" ناویان بردووە و دوای دوازدە ڕۆژ لەنێو میران لە کوێوە هاتبوو بەوێدا دەگەڕێتەوە دزفول.

باڵێرەدا ڕەگەڵ کاروانی دووەم سەفەری ئەدمۆندز بکەوین و سەردانێکی دزفول و بروجێرد بکەین. ئەوەی ئەو ڕاسپاردە ڕامیارییە باسی کردووە تەنیا سەروەریی سەیتەرەی ئینگلستانە بەسەر ناوچەکەدا، چاوچنۆکیی خان و فەرمانڕەوایانی مەڵبەندەکە بۆڕاکێشانی سەرنجی گەڕۆك و نوێنەرانی ئینگلیز بۆ وەدەستهێنانی سەروەت و سامان و خۆ نێزیککردنەوە لەو لەخۆبایی خۆیان و بەرژەوەندخوازی. باسێکە لەسەر بارودۆخی بەشمەینەتانی زۆرینەی خەڵکی لوڕستان، لە بواری ئابووری و فەرهەنگی دوا ساتەکانی سەڵتەنەتی ئەحمەدشادا. لەسەر ئاژاوەگێڕی و کینەی خانەکان دەڕوات و هەروەك پێشتر کروزێن باسی کرد ئەم نەهامەتییە شاکانی قاجار و شاهەباس بە سەر تایەفەی لوڕانی هێنا. هەر دەڵێی ئەدمۆندز تەنیا کاری ئەوەیە لە یاداشتەکانی خۆیدا ناڕاستەوخۆ باسی بەرزی خۆی و نزمی خەڵکی ئەو ناوچەیە بکات.

ئەمڕا، ئەدمۆندز لە سپتەبەری ١٩١٧ ز. بەرامبەر بە ١٣٣٦ ك.م. بە هیوای بروجێرد لە دزفول دێتە دەرێ. ئەمجارەش بۆ سلامەتیی سەری بارمتە دەگرێ و لە دزفول دای دەنێت. میرحاجی ناوێك لە تایەفەی میر چەند لاپەڕە سەرتر لە سەفەرنامەی خاتوو دووراند دا ناوی هاتبوو، لەسەر ویستی خۆی ئامادە دەبێت ئەدمۆندز لە دزفولەوە بەرێتە خوڕەماوا. لە یەکەم مزڵدا چەکدارانی میر و جودکی دێنە پێشوازی نوێنەری سیاسی ئینگلیز و ڕەگەڵی دەکەون. ئەدمۆندز لێرەدا باسی تایەفەکانی نێو ڕێ دەکات، بۆ وێنە ئاماژە بە سەگواندانی ڕەحیمخانی دەکات: دوو کەس لەو تایەفەیە بە ناوەکانی راوچی محەمەد و چراغ خان ساڵێك لەوەپێش سەروان نۆئێلی ئینگلیزی هەڵدەپێچن باجی لێ بستێنن، دوایە ئەوان لە ناوچەکە دەرکران. ئێستە نەزەرعەلی خانی تەرحانی بە زۆری هەوڵی دەدا لەلایەك لەو دوانە خۆش ببم و لە لایەکی دیکەش واز بێنم لە تاوانی بەهاروەندان، بە پشت گێری لەو دووکەسە کاروانێکیان ڕاگرتبوو. ئەمجار دەڵێ دوو کەسەکەی ناوم بردن هەل و دەرفەت دەقۆزنەوە و لەنێو ئاپۆرەی بەهاروەندان هاتنە دەرێ، ئاوزەنگیان گرتم و لاقیان ماچ کردم. ئەوە لەنێو لوڕاندا ئەوە دەگەیەنێ یان لە تاوانم خۆشبە یان بمکوژە. ڕەزایەتم پێدان و بۆ سلامەتیی سەری خۆم و ڕێگەنەگرتن لە کاروانەکەم لە لایەن بیرانوەندانەوە، بە چاکم زانی ئەوان هەتا بروجێرد بگرمە ژێر باڵی خۆم.

باسی هەواڵ ناردنەکانی سەگوەندانی عالیخانی دەکات دەیانەوهێ ببنە خزمەتکار، دووبەرەکی جودکیان، برسێتی و هەژاری قیلاوەندان تەنانەت نییە نانی ئاردی بەڕوو بخۆن و باسینامەی نەزەرعەلی خانی تەرحانی دەکات" سەبارەت بە هاتنی بۆ خوڕەماوا بۆ هەڤپەیڤینێك لەمەڕ داهاتوویی لوڕستانەوە. هەروەهاخۆئامادەکردنی کۆمەڵێك لە خانەکانی حەسەنوەندان واتە مێەرعەلی خان سەردار ئەمجەد و باقرخانی کاکاوەند و زۆری دیکەش لە دژی نەزەر عەلی خان و ناقایلی خۆی لە هەوڵی حەسەنوەندان باس دەکات.

بەهەرحاڵ، ئەدمۆندز شان بەشانی میرحاجی کە دەڵێ" شەو و ڕۆژ لههەوڵی پارە پەیداکردندابوو، بە قەڵای ڕەزە و پردی زاڵ و ملەی کیالاندا کاروانەکەی دەپەڕێنێتەوە. لەنێو ڕێدا میرحاجی پێی دەڵێ چ ڕاست و چ درۆ تەواوی هۆزەکان خەڵکی عورووسیاتیان ناخۆش دەوێ، قاجاریان لەبیر چۆتەوە، هەموویان تۆیان خۆش دەوێ توانیوتە خەڵکی لوڕستان وەدووی خۆت بدەی، بەڵام لەوە دەترسم ڕۆژێك بێن و ناوچەکەمان لەدەست دەربێن و ئاکار و کردارتان ئاواباش نەبێت. لەنێو ڕێگەدا میرزا محەمەد، بەڕێوەبەری ئیدارەی پۆستی خوڕەماوا دەگاتە کاروانی ئەدمۆندز، دەکەوێتە زەمکردنی ژنانی دێرکۆوەندی و باسی جوانی و بەغیرەتی ژنانی دلفان و سلسلە دەکات و لە پەسنی جوانی یەکێ لە و ئافرەتانە ڕادەچێت.

ئەدمۆندز دەڵێ تفەنگی کورتی کارابین لەنێو لوڕەکاندا زۆرە، دووساڵ پێش سەفەری ئەو لوڕەکان دوای تێك شکانی هێزی ژاندارمە و نیزاموسەڵتەنە ئەو چەکانەیان وەدەست کەوتبوو، بەڵام لەوحەیامەیدا بەبۆنەی ئەوەی فیشەکی ئەو تفەنگە کورتانە وەدەست ناکەوێ لە نرخیان کەم دەبێتەوە. چوار فیشەك لە خوڕەماوا بایی سێ قڕانە و نرخی یەك تفەنگی ئینگلیزی ٦٠ تمەن باس دەکات. هەر چەشنە چەك و تەقەمەنییەك بە سواری هێستر لە پشتکۆ وە ناوچەی کەڵەوڕەوە دەگاتە دەستیان.

فەرمانبەری ئینگلیزی دوای ئەوەی لە کار تەواو دەبێ جلوبەرگی لوڕی دادەنێ، پۆشاکی ئینگلیزی دەکاتە بەری و کڵاوی هامبورگی لەسەر ئەنێ و لە دەوروبەری شاهەنشا لەگەڵ پێشوازی خان و بەگلەری بەهاوەند و والیزادە و چاغروەندان و شەشسەد سواری بیرانوەند رووبەڕوو دەبێت، لێرەوە بە پێشوازیکردنێکی گەرم دەگاتە خوڕەماوا. لە نێوان دوو بنەماڵەی ناوداری شارەکە واتە چاغروەند و والیزادەکاتن ڕکابەری ساز

دەبێت هەرکەسەو بۆخۆی هەوڵ دەدات ئەدمۆندز میوانی بێت. ئە پیاوە ئینگلیزیە پێشتریش بەم حیس و بەیسەی زانیبوو، پێی باش دەبێ لە بنکەی حکوومەتی دابەزێت. لەو کاتەدا موعینووسەڵتەنەی چاغروەند کوڕانە دەچێتە دیوەخان و هۆدەیەك بۆ میوانی تازە دەڕازێنێتەوە. ئەمەش بۆ ئەوەیە ڕێز و شکۆمەندیی خۆی بەرێتە سەرێ. والیزاکان هەوڵ دەدەن ئیدومۆندز ڕازی بکەن ئەو شوێنە جێی متمانە نییە و لەوێ بێتە دەرێ. دیارە ئەوان بە چ ئامانجێك ئەم قسانەیان دەکرد، ئەویش گوێی ناداتێ.

بە داخەوە ئێستەش ئەو ناتەبایی و دڕدۆنگییە لەنێو مەزن و میر و خەڵکی ئاسایی لوڕستاندا بە تایبەت لە خوڕەماوادا هەر ماوە و ڕەگی داکوتاوە. هێشتا نەبووە کەسێکی خۆی لەم ساڵانەدا بۆماوەیەکی زۆر لەو شارەدا وەك سەر چاوەیەکی گشتی بمێنێتەوە. ئەوەندەی من بزانم قەت نەبووە لە خەڵکی ناوچەکە کەسێك سەرۆکایەتیی پارێزگەی لە ئەستۆ بووبێت. ئەوانەی بەڕێوەبەرایەتیی ئەرك و ئیدارەیەکیان لە ئەستۆدا بووبێت بەهۆی ناتەبایی ناوەخۆ هەر بۆ ماوەیەکی کورت بووە.

هەروەها" ئەدمۆندز قەڵای خوڕەماوای بە وێرانی چاو پێکەوتووە و دەنووسێ مزەفەرمولك بۆ سازکردنی کاروانسەرای موحسێناوا کە لە ناوی ئەو گیراوەتەوە کەڵکی لە خشت و کەرپووچی قەڵاکە وەرگرتووە. زۆر لەوە دەچێ موحسێناوا هەر ئەو گوندی (موسەم) ی ئێستەبێت. نابێ ئەوەمان لەبیر بچێ جەنابێ مزەفەرمولك هەر ئەو کەسەیە بەمەبەستی فارسی نووسین کەتیبەی دەورەی سەلجووقیانی هەڵکۆڵی. هەروەها بە بەوتەی ئەدمۆندز، خان و والیزادەکاتن لە خشتی کاروانسەرا وێرانەکەی موحسێناوا خانووبەرەی خۆیان ساز کردووە.

لە جێیەکی دیکەدا دەنووسێ شەقامەکانی خوڕەماوا زۆر پیسن، بەڵام وەك دزفول و شوشتەر ئاوڕۆ بەسەر شەقام و کۆڵاناندا ناڕوات. شارەوانی و ژاندامەری لە خزمەت گوزاری ماندوونین. بازاڕ پڕە لە کەلوپەل و دووکانەکان سەربەسەیوانن، بۆئەو شتومەکیان لێ خراپ نەبێت. کاروانسەرایەکی باش لەشاردا هەیە، وێدەچێ مەبەستی ئەو کاروانسەرایە بێت کە ئێستە بۆتە ڕاستەی ئاڵتوون فرۆشان. بە تەنیشت قوتابخانەیەکدا تێپەڕیوە بەچکە موسوڵمانان لە حەساری مەدرەسەکەدا خەریکی دەورکردنەوەی وانە بوون و کەلیمییەکان لە ژوورێکی تەنگ و تاریکدا دەرسیان

خوێندووە. ئافرەتانی شارنشینی بە جان و پاك و خاوێنی دیتوە لەچاو ژن و منداڵی ڕەوەندان، کچان بە جلکی سوور و ڕەنگینەوە و ژنانی بەتەمەن بە جلوبەرگی مۆرەوە سەرنجی ڕاکێشاوە.

ئەدمۆندز دوای ئەوەی ١٧ ڕۆژ لە خوڕەماوا دەمێنێتەوە دەچێتە دەرەوەی شار. بە تەنیشتی پاپی خاڵدار و مەخمەر چیا و لەگەڵ سەرهەنگ مووساخان سەرداری شەڕ دەچێتە روبات، ئەوشوێنەی گوتبوویان نەوتی لێ دۆزراوەتەوە، حەز دەکات لە نێزیکەوە بیبینێت، کەچی چشتێ لەوێ نابینێ. دەستەیەك پێی دەڵێن مووساخان لە ترسی ئەهەوەی ماڵیات نەدا بە دەوڵەت سەری چاڵە نەوتەکەی بە لێفە کۆن داپۆشیوە و گڵی وەسەر کردووە. چاوی دەکەوێ بە بەشی خوێڵیەن، مووساخان لە فرۆشی خوێ پیتاك لە ڕەعیەت دەستێنێ. بێجگە لەوەی سەیرانی ناوچەکە دەکات شەوێکیش میوانی بەهاروەندان دەبێت، کەسێك لێی دەپرسێ ئاخۆ لە تایەفەی ئینگلیزە یان لە هۆزی ژاپۆنە؟

دەنووسێ" دوای یەك دوو ڕۆژ مەلاکان قەولی ئەدەنێ بچن بۆ لای، بەڵام دووبەرەکی ئەم چاوپێکەوتنە پەك دەخاتەوە. وا پێدەچێ دەستەیەك پێیانخۆش بووبێ بچن بۆ لای" بەڵام لە ترسی لۆمە و لەقەمی دەستەی دووەم پاشگەز بووبێتنەوە.

ئەدمۆندز لەنێو بیرانوەندان باسی کەسێك دەکات بەوناوی مەسخە یان مەسخاڵی کوێخای تایەفەکە دزێکی بەناوبانگ بووە و کەحێلێکی سپیی هەبووە. دەڵێ بەهیوا دەبێ کچێکی لوڕ بخوازێ، بەڵام بەو مەرجەی بتوانێ مایەنەسپی جانگیرخانی سەگوەندان بڕفێنێت. مەسخە هەر ئەوشەوە لەبەر خۆیەوە ئەم شیعرە دەخوێنێتەوە:

سەرێ نەبێتە سەرگەردی دڵبەر/ یاخوا ئەوسەرە هەربێ بێ سەر

چوست و چالاك مایەنی کەحلان دەڕفێنێت. ئەدمۆندز دەنووسێ:

"بۆ ئەوەی بچمە بروجێرد دەبێ لە ناوچەی بیرانوەندان بڕۆمە دەرێ. کوێخاکانی ئەو تایەفەیە داوای باجم لێدەکەن. لەوە دەترسان لە سیلاخۆر نەتوانن هەقی خۆیان لە خانەکان بستێنن. بەڵێنی دیاری و خەڵاتم پێدان ڕازی بوون و لەگەڵم هاتن."

بەوتەی ئەو زۆرینەی خانەکانی تایەفە ئەو ناو و لەقەمەی پێیان داون" خەساریان کردووە و شایانی ئەم نازناوانە نەبوون. ئەمەش کاتی خۆی ئاڵمانەکان بۆ ئەوەی جێی دەستیان بۆ تاڵانکردن خۆش بکەن تاکو نێزیك قوم چوونەتە پێشێ ، ناوی مەزن و شاری

وێران. بۆ تالاَن و برۆ گەیشتنە سەر سنووری شاری قوم. زێڕ و ئالّتوونی ئالّمان بووە هۆی دەولّەمەندیی بیرانوەندان. هەلّبەت ئیمای ئەدمۆندز لە خۆڕا نییە. لە سەرچاوەی دیکەدا هاتووە لە سەرەتای یەکەمین شەڕی جیهانیدا ئەلّمان بۆ ئەوەی زەبرێکی باش لە ئینگلیز بوەشێنێت، لە خاکی ئێراندا هێزێکی چەکداری لە عەشیرەتەکان وەخڕ کرد، کێنت گراف کانیتس کارگێڕی سەربازی ئەلّمان لە تاران بە کەلّکوەرگرتن لە ئاژاوە و پشێونی دەسەلاّتی کاتی بە سەرۆکایەتیی نیزاموسەلّتەنەی مافی لە خۆرئاوای ئێران، توانی بە سواری ئەسپ لەم هۆز بۆ ئەو هۆز پێشنیاری چەك و پارە بدات بە خێلّەکیان و" لە دەوری خۆی بەختیاری، قەشقایی، لوڕ و زۆر کەسی دیکەش کۆ بکاتەوە و توانیی نێزیکەی دە هەزار سواری چەك بەدەست ئامادە بکات. لە ئاخریدا ئەو پلانە سەری نەگرت و هێزی ئالّمان دەم لەپووش بوون و" لەو نێوەدا چەند تایەفەیەك نانیان کەوتە ڕۆنەوە و" گەیشتن بە سەروەت و سامان.

سیسیل جان ئەدمۆندز، دەگێڕێتەوە کە لە نێزیکەوە چاوی کەوتووە بە زۆر یەك لە خانەکانی تایەفەی بیرانوەند بۆ وێنە غوەلاّمعەلی، عەلی مەردان و شێخ عەلی. وەختێ چاوی بە عەلی مەردان کەوتووە جلوبەرگی یەك دەستی رووسی لەبەر دا بووە، ئەوکاتی لە دەڤەری بروجێرد دەسەلاّتی بووە و گا بە دەنگی ڕۆیشتووە. عەلی مەردان پێی دەلّێ کە پارە لە رووسیە وەرناگرێ، بەلاّم ئەدمۆندز دەلّێ" ئەو کەلوپەلەی دەگاتە بروجێرد بۆ هەر بارێك یازدە قڕان باج دەستێنێت.

ئەدمۆندز لە ماوەی ڕێگەدا شەوێ دەبێتە میوانی یەکێ لە ئاغاکان. بۆ بەیانییەکەی، عەلی مەردان خان جلوبەرگی شینی کالّ دەکاتە بەری و" شەڕوالّی رووسی لە پێدا و چەکمەی درێژ تا سەر ئەژنۆ، کلاّوی لوڕی دەنێ بە تیلاکی سەریەوە، قەفی سمێلّی لە بناگوێی توند دەکات و دەکەوێتە پێش ٨٠ سواری چەك لە شان، بە ئالاّی رووسییەوە هەتا بروجێرد ئەدمۆندز بەڕێ دەکەن و بە شێوەی نیزامی دەیبەنە شار. لێرەوە سوارانی گودەزی و کارگێڕیی میری دێنە پێشوازی و بە شان و شکۆ لە دەروازەی باشوورەوە پێدەنێتە بروجێرد.

ڕۆژێك دوای حەسانەوە نوێنەری دەسەلاّتداری شارەکە و کۆمەلّێك لە میر و مەزن و ئاقلّمەند و بەڕێوەبەرانی دادوەری و تەلگرافخانە و بازرگانی بە ناوبانگی شار و

کابرایەکی جوولەکە دەبێت، دەچن بۆ چاوپێکەوتنی. نامەی تەلەگرافی لە وەزارەتی ناوەخۆوە بە فەرمانی دادوەر دەگاتێ کە تێیدا نووسراوە رووسەکان لە بروجێرد بچنە دەرێ، ئەم دەنگۆیە پەرە دەستێنێ کە ئەدمۆندز بەتەمایە کۆنسوولی خۆی لە دزفول بۆ بروجێرد ڕاگوێزێت. لە دووهەم ڕۆژی هاتنی ئەودا دەستەیەك بۆ داخوازی لابردنی مێو خانەی شار و کەس گەلێك بۆ شکایەت لە دەست بازرگانانی لێکەوتوو دێنە سەردانی، بەڵام خۆ لە قەرەی دادوەری نادات. ئەدمۆندز دەڵێ خەڵکی بروجێرد بە پانەوە رووسیان خۆش ناوێ. هۆی ئەو دژایەتییە بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە کە رووسیە گەنم لە ئێران دەکڕێت و ڕوبلی رووسی بێ نرخە و ڕوبلێك بایی چوار شاییە. لە بروجێرد چاوی بە نوێنەری رووسیە کەوتووە کەچی ئەو نەچۆتە دیدەنی.

هەروەك دیارە ئەدمۆندز دوای ماوەیەك گەڕاوەتەوە خورەماوا، لەوێدا گرفتی بۆ پێش هاتبێ و لە کۆتاییدا توانیبێتی بچێتە کرماشان.



سەر ڕاجێر ئیستیونس،ی ئینگلستانی سەیروسەفەری خۆی ناو ناوە وڵاتی سۆفیای مەزن، بەڵام هێشتا وەرنەگێڕدراوەتە سەر زمانی فارسی. گومان بۆ ئەوە دەچێت لەم سەرنامەدا مەبەستی لە شاعەباسی سەفەوی بێت، بەڵام ڕووداوی کتێبەکەی تایبەتە بەم سەردەمەی خۆی. ئیستیونس وڵاتی ئێرانی بە کابەی میوان و گەڕۆکانی شەڕخواز دەزانێ و بەتایبەت بۆ ئەویندارانی ئەدەب و هونەر جێی سانەوە بۆ سەیر و سەفەری جیهان. لەمەڕ لوڕستان بەربڵاو چەند یاداشتی بەپێزی نووسیوە، وەك بابەتی جوگرافیایی باشوور و خۆرهەڵاتی لوڕستان لەچاو کوردستان سەر بە مۆر دەناسێنێ و دەڵێ دانیشتوانەکەی کەمترە و لە بەشی خۆرئاوادا ئاوەکانی زاگرۆس دەیگرنەوە" کە تیرەشانی کرماشان و بروجێرد لە خۆ دەگرێ و شۆڕ دەبێتەوە بۆ ئاوی دز و باکووری خۆرئاوای دەچێتەوە نێزیك کێوەکانی قەسری شیرین.

لەبابەت چیاکانەوە زاگرۆس لە هەمبەر کێوەکانی خۆراسان ڕادەگرێ و دەڵێ، زاگرۆس بۆ ئاژەڵداری لەوپەڕی باشیدایە و" لەوەرگەی ڕەوەند و کۆچەرانی مەڕدارە بۆ حاواندنەوەی هەزاران سەرئاژەڵ، خێڵەساتێکی زۆر ڕازی دەکات.

نووسیویەتی لەژێر مێژەری کوردان و سیاچەمانی ژنانی لوڕ و ڕەشماڵی هەوار چیان و تەنانەت ڕوخساری لادێ نشینان دا، لەژێر تەپلەی ئەواندا، مرۆڤ دەتوانێ پەی بەرێت بە دابونەریت و کولتووری کەونارا و شێوازی ژیان و گوزەرانی دەودەکاتنی پێش ئیسلام و تایبەت مەنییەکانی ژیانی لوڕان لەمرۆدا بە ئاوێتە بوونەوە تەماشا بکەن. لەسەر ئەم بابەتە ویلسن، کەلێرە بەداوە لەگەڵی هاو سەفەر دەبین سەبارەت بە لوڕەکان دەنووسێ" لوڕان لەسەر دوندی چیاکان بەشێوەی ڕابردووان ئاگر دەکەنەوە، ئافرەتیان هەروەك بەرینانی خۆ دەچنە سەر گرد و تەپۆڵکە بەرزەکان دەستە و دۆعا رادەوەستن. بەخوێنی ئەو حەیوانەی دەیکوژنەوە بەردەکاتن دەنەخشێنن، سوارانی لوڕ کەحێل و محەندەکاتن بە زین و گورز و گوڵێنگ دەڕازێننەوە و بە دەشت و دەردا دەکەونە غارغارێن و دیمەنی هەزاران ساڵەی باب و کاڵی خۆیان زیندوو ڕادەگرن.

ئیستیونس سەبارەت بە مێژووی لوڕستان ئاوا دەنووسێ" فەرمانڕەوایانی ئەم دەڤەرە لەسەر کورسی خوڕەماوا نە بەدەستی هۆلاکۆخان لە نێوچوون و نە بە دەستی تەیموری لەنگ، بەڵکە لافاوی ڕەشی شاهەباسی سەفەوی گەیشتە سەریان و دەسەڵات و ماڵباتیی ئەتابەکانی ڕامالّی.

دەڵێ لوڕان زۆر زۆر شانازی بە چەتەیی و ڕێگری خۆیان دەکەن، جارێك بە گەشتیارێك دەڵێن: "لە دنیادا کەس نییە وەك ئێمە چەتە و ڕێگر بێت." هەربەم هۆیەوە زۆریان ناو گرتۆتەوە بۆوێنە: چیای دزان، پیرە دز، دۆڵی دزان و..."هەر ئەم ناوانەش قسەی ئەوان دەسەلمێنێت. تەنانەت ئەم گەشتیارە باوەڕی وایە وشەی فەیلی بە مانای "دز یان دزانە".



لەم سەیر و سەفەرەماندا سەردەکەین بە نێو کتێبێکی دیکەدا و چەند لاپەڕێك لە سەفەرنامەی گەشتیارێکی ئینگلیزی واتە ئارنۆڵدویلسین دەخوێنینەوە، ئەم گەڕۆکە لەنێو سەفەرنامەکەی خۆیدا زانیاری زۆری لەمەڕ مێژوو، جۆغرافا، ئاسەوار و کەونینەناسی، ئاژەڵ و ڕووەکناسی لە ئێراندا خستۆتە ڕوو. زۆرینەی باسەکەی لەسەر جادەی شوسە و هێڵی شەمەندەفەر لوڕستانە بۆ باشوور.

ویلسین کارگێڕی سەربازی و خاون پلەی ئینگلستان، ساڵی ١٨٨٤ ز. لە دایك بووە. بە هۆی ئەوەی بەچکە قەشە بوو، پەروەردەیی ئاینی کاری تێکردبوو، هەربۆیە تەمەنێك بەو خوویەوە ژیا، لە کۆلێژی ئەفسەری سنت لەندەن خوێندنی تەواو کرد. لەو ڕۆژگارەدا زۆرتر ئەفسەرانی ئینگلزی ئەرکی چوونە دەرەوەی ولاتیان دەکەوتە ئەستۆ، بۆ ئەوەی لە بەشی وەزارەتی دەرەوەی ولاتدا بە ئەرك و فەرمانی رامیاری ڕابگەن. لێرەوە ویلسین لە ساڵی ١٩٠٧ ز.دا بوو بە کارگێڕی کۆنسوولی ئینگلیز لە خوڕەمشار، دوو ساڵی تەواو لەو پۆستەدا مایەوە. دواتر لە ساڵی ١٩١٤دا پلەی سەرهەنگ دووەمی پیێ بەخشرا و" بووە ئەندامی ناوبژیوانی کێشەکانی سنووری ئێران و عوسمانی. ساڵی ١٩٢١ تا ز١٩٣٠. وەك بەڕێوەبەر لە کۆمپانی پێشووی نەوتی ئێران و ئینگلیز خزمەتێکی شایانی بە بریتانیا کرد. لەو ماوەیەدا بە تەواوی فێری زمانی فارسی و عارەبی بوو.

ئەو پیاوە ئینگلیزە بیرەوەریەکانی خۆی لەساڵەکانی ١٩٠٧ تا ١٩١٤ ز. دا کە لە باشووری خۆرئاوای ئێران نیشتە جیێ بووە بە ناوی سەفەرنامەی ویلسین نووسیوەتەوە و لە ساڵی ١٩٤٠ ز. دا ماوەیەك بەر لەوەی گەلای تەمەنی لە درەختی ژیانی هەڵوەرێت چاپی کردووە. هەروەك خۆی باسی دەکات لە گەرمەی شۆڕشی مەشروتە خوازی ئێران دا سەرەتا لە هێندوستانەوە هاتۆتە کەنداوی فارس و لە بەندەر هەباسەوە گەیوەتە خوڕەمشار. لەسەر فەرمانی ئنتلجنس سەرویس، دەستی کرد بە پلان دانان و نەخشەی زەویزاری خوزستان و کۆەکیلۆیە و بەختیاری دانا و ئەم کارەش یارمەتیدانێکی باش بوو بۆ هەڵمەتی دۆزینەوەی چاڵەنەوت لە ناوچەکانەدا. جلوبەرگی خەڵکی ئەو مەڵبەندەی کردۆتە بەری و تێکەڵ بەوان بووە و، زۆر ژیرانە باسی قنیاتکردنی خێڵەکیان و خەڵکی بەختیاریی کردووە.

ویلسین پێش ئەوەی بچێتە لوڕستان و لەو مەودایەدا کە لە دزفول دەبێت ئاماژە بە بارودۆخی لوڕستان دەکات و دەنووسیێ:

"٦٠ ساڵ پێش ئێستە، دزفول لەگەڵ هەمەدان و ناوەندی ئێران زۆر لە هاتوو چۆدابووە، بەڵام ئەمڕۆبەهۆی ئەوەی سەرۆك عەشیرەتان مل بۆ فەرمانی دەسەڵاتی تاران ڕاناکێشن، دەربازگە و کاروانە ڕێیان بەستووە و کەلوپەلی بازرگانی خۆیان لە ڕێگەی بەختیاری یان بە ڕێگەی بەغدا و کرماشاندا ڕەوانەی ئیسفەهان دەکەن، ئەمەش زۆر

هەڵدەگرێ و گران تەواو دەبێ. رووسیەیش لەو دەرفەتە کەڵك وەردەگرێ و کەلوپەلی خۆیان بەهەرزانتر دەفرۆشن."

سەبارەت بە مەترسی نێو ڕێگەکان دەنووسێ:

"لەساڵی ١٩٠٤ ز. سەروان لوریمێر شابەندەر (قۆنسول)ی ئینگلیز لە ئەهواز و سەرگورد داگلاس کارگێڕیی سەربازیی ئینگلیز لە تاران وەختێ بە لوڕستاندا تێدەپەڕین کەوتنە بەر پەلاماری دز و گۆران و ئەوەی پێیان بوو بە تالان چوو خۆیشیان بریندار بوون" ئێستەش کە ٥ ساڵ بەسەر ئەم ڕووداوەدا رادەبرێت" لوریمێر دیسان چۆتە سەردانی والیی پشتکۆ کەلوپەلی بەتالانچوویی ئینگلیزی بۆ بستێنێتەوە و ئەمنییەتی ڕێگەکانیش بپارێزێت، بۆ ئەوەی پێداویستیی هەرزان" ڕەوانەی باکووری ئێران بکرێت."

ویلسین لە ساڵی ١٩١١ ز.دا بە فەرمانی پلەبەرزانی ئینگلیز سەرۆکایەتیی قۆنسولی خۆی لە خوڕەمشار ڕادەستی کاربەدەستان دەکاتەوە و" دەچێتە لوڕستان و لەسەر هێڵی ئاسنی ئێران خەریکی لێکۆڵینەوە دەبێت. لێرەدا ئاوا دەنووسێ:

"زۆر لە مێژ بوو بە دڵ حەزم دەکرد بچمە ناوچەی لوڕستان کە ماوەیەك بوو پشێوی و ئالۆزی تێکەوتبوو، دەمزانی زۆر شوێن ماوە هێشتا دەستی گەڕۆکانی ئەورووپی وێ نەکەوتووە و هەروا سەر بەمۆر ماوەتەوە. ئەوێ بۆ کاری نەخشەدانانی من زۆر لەبار بوو. هۆز و خێڵاتی ئەم دەڤەرە ساڵ دەوازدەی مانگ کاریان بۆتە دزی و ڕێگری لەسەر کاروانەڕێ و دۆڵ و دەربازگەکان...هەر وەختێ بیرم لێ دەکردەوە ئەگەر سەرکەوتوو بم، یەکەم کەسێك دەبم لەو مەڵبەندە ئالۆزەدا بە قازانجی وڵاتی خۆم کارێکم کردووە، خۆشحاڵ دەبووم و وەك گوڵ دەگەشامەوە."

ویلسین لە بەهاری ساڵی ١٩١١ ز. لەسەر پێشنیازی شێخ خەزعەلی داوا لە والی پشتکۆ و نەزەرعەلی خانی تەرحانی سێ کەس لە خانەکانی سەگوەند بکات یارمەتیی بدەن و تاکو بچێتە لوڕستان. لەسەر ڕاسپاردەی یەکێ لە کاربە دەستانی شەریکەی گری مەکنزی، مەلامحەمەدتەقی دێرکۆوەند بیرەوەری لە راولینسن دەبێت، بیکاتە هاوڕێ و چاوساخی خۆی. لەنێو ڕێگەی ئەو چەند ڕۆژەدا میوانی فازڵ خان و حەسەن خان سەرۆکانی تایەفەی سەگوەند دەبێت. گەشتیاری ئەم جارەمان بەرگی لوڕی دەکاتەبەری بۆ ئەوەی وەك بیانییەك نەیبینن، دەکەوێتە کۆکردنەوە و بەدەست هێنانی زانیاری تاکو

وەك خۆی دەڵێ ئەگەر ڕۆژێك کۆمپانی نەوت دەورو بەری لوڕستانی تەنییەوە، بتوانێ سەرچاوەیەکی بە دەستەوە بێت. لە درێژەدا دەنووسێ:

"چەند ڕۆژ دواتر لەگەڵ سەرۆك هۆزانی تایەفەی بەهاروەند و قیلاوەند و مەشەدی عەیوەزی کەردار سەبارەت بە نەخشەی مسافرەتی لوڕستان کەوتمە پرس و ڕاوێژ... خەڵکەکە بە گشتی لەشێوەی رفتار و کرداری تایەفەی بیرانوەندان کە هەر هەموویان دز و جەردەن، زۆر دڕدۆنگ و نیگەران بوون. ترسی ئەوەیان هەبوو، دار و دەستەی ئەو هۆزانە و تایەفەکانی جودکی و پاپی لە وەختی هاتوچۆدا دەبنە کۆسپ و لەمپەر لەسەر ڕێگەم."

ویلسین دەڵێ ئەوکات و خەڵکی شار و گوندەکاتنی لوڕستان لە ژیانێکی کۆڵەمەرگیدا بوون و تابڵێ هەژار و بێبەرگ و پێخۆر بوون. سەرە ڕای ئەمانە دەکەوتنە بەر پەلاماری چەتە و تالانچیان و شڕە و سیپاڵیان دەڕفاندن. ئەوگەڕۆکە پێی وا بووە تەنیا چارەیەك بۆ بە بنەبڕکردنی ئەو بارودۆخەی ناوچەکە ئەوەیە هێڵی ئاسن بەو دەڤەرەداڕاکێشن و ڕێگەی شوسەیان بۆلێدەن و مەزرەوان و سنوور داری دامەزرێنن، هەروەك خۆی دەڵێ دەسەڵاتدارانی خۆی و ناوچەیی ڕێگری لەم کارەدەکەن، دەزانن ئەگەر مەڵبەندەکەیان ئاوەدان بکرێتەوە دەسەڵاتی ناوەندی پەلیان دەقرتێنێ و جووڵەیان لێ دەبڕێت.

ویلسین لەگەڵ سێ کەس لە دەمڕاستانی قیلاوەندی قەولنامەیەك دەنووسن و ئەوان سوێند بە کەلامی خوا دەخۆن تاکو ئەو پیاوە ئینگلیزیە بە سەلامەتی ببەن لە خوڕەماوا داینێن و لەبری ئەو کارە ٥٠ لیرەی ئینگلیزی و فەردەیەك شەکەر وەربگرن. لە قیلاوەند چیرۆکێك دەبیستێ بەو شێوەیە ئەیگێڕێتەوە: ساڵێك پێش ئێستە کوڕێکی ٢٣ ساڵە ئەویناری کچێك دەبێ لە تایەفەی دراوسێی خۆیان. بابی کچە بەهۆی ئەوەی لەگەڵ تایەفەی ماڵی کوڕەکە نێوان ناخۆشیان دەبێ پێیان دەڵێ خزمایەتیان لگەڵ ناکات. ڕۆژێك بابی کیژێ لەگەڵ دەستەیەك مل دەنێن لە تالانکردنی سەیدانی خەزرەج. دڵدۆڕاوی نازدار حەیران چەند گەنجێکی کادەرویشی لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێ و دەچن خۆدەکەن بە ڕەشماڵی بابی کچەدا و لەنێو زریکە و قیژەی ژناندا پیلی گراویی خۆی دەگرێ و کیسەیەك پارە لەباتی شیربایی بەجێ دەهێڵێ و تەقڵەکوت بە سواری دەگەڕێنەوە. بابی کیژێ وەختێ لە تالانی دەروجیرانی دەگەڕێتەوە سەیر دەکات کچەکەی ئەویش بە تالان چووە، کەیخوا و سۆفیلکان دەکەونە نێوانەوە و" بە ناچاری ئاشتەواییان

لەگەڵ دەکەن و کێشەکە بەکۆتا دێت. ویلسین دەنووسیّ بە ڕێکەوت چەندێك دواتر ڕۆژێك تووشی ئەو ژن و مێردە دەبێت و بووکێی زۆرجوان شۆخ و شەنگ وەبەر چاو دێت، کە دووکۆڕپەی بە ئامێزەوەیە. ئەو مافە دەدا بە ئەو شێرە کوڕە لە چەشنی فەرهاد تاقی بێستوون بکۆڵیّ و شیرینی نازدار لە خوسرەوی لوڕستانی بستێنیّ.

ویلسین لەو سەفەرەدا چاوی دەکەویّ بە کێشە و هەرای بەهاروەند و قیلاوەندان، مەڕ وماڵی یەکدی دەڕفێنن و لەو نێوەدا کوڕە جەحێڵەیەکی لوڕ تێدا دەچێت. لەسەر نەریتی ئەو شوێنە نای شۆرن و خوێن بەبەرگەوە دەینێژن.

هەروەك دەنووسیّ شوێنی هات و چۆ و ڕێگەکان بە هەمووولایەکدا دەخاتە سەر پلانی خۆی و نەخشەی بۆ دەکێشێتەوە. لەنێو ڕێدا هەواڵی پێدەگات چەند کەس لە خانەکانی بەهاروەند، هەر ئەو کەسانەی کاتی خۆی لوریمێر شابەندەری ئینگلیزی لە ئەهواز لە ڕێگەی لوڕستان ڕووتیان کرد، سەرەڕیّ دەگرن و دەڵیّ تاکو ویلسین حەقی ڕێداری نەدات" ڕێگەی دەرچوونی پێنادەین. بەم جۆرەی خۆی دەنووسیّ" پێمل نابیّ و بە هەرسیّ کوێخاکەی هاوڕێی دەڵیّ" ئێوە سوێندخۆرن و دەبیّ کارەکەتان بەنیوەچڵی نەهێڵنەوە و ئەو ڕێگرانە بگرن. پیاوماقووڵانی قیلاوەندی لە شوێنێك بە ناوی بادامەك لەگەڵ دەمڕاست و ڕیش سپیان دەکەونە گوتوبێژ و خۆیان بۆ شەڕێکی دەستەویەخە ئامادە دەکەن. دەمودەست خەبەر دەگات چەتەی بەهاروەندی ڕانێکی بادامەکیان ڕاداوە و شوانەکەشیان کوشتووە. کوژراوەکە هەر ئەو جەحێڵەیە ویلسین پێشتر باسی کرد، دەنووسیّ" ڕیش سپیی بادامەکی بە باوەمەزنیان سوێند دەخۆن" لە تۆڵەی ئەو کوڕە جەحێڵە دا هۆزی بەهار وەندان لە خوێن دەگەوزێنن. لێرەدا دەڵیّ پیرە پیاوی ڕیش چەرمووی بادامەکی دەچێتە سەر بەرێك و دەگوڕێنیّ و تایەفەکەی هان دەدات بۆ تۆڵەکردنەوە. هەر هێندەی پیّ ناچیّ حەشامات بە دار و بیور و چەك و کێرد و بێڵ و گالۆکەوە لە دەوری وەکۆ دەبن. ویلسین دەڵیّ" بوو بە جەنگی مەغلۆبە و چەند کەس لە بەهاروەندان کوژران. بەیانی بەردەوام ئاوری شەڕ بلێسە دەستێنیّ، ویلسین دووربین بە دەست دەچێتە سەر گردێك بۆ ئەوەی لە دوورەوە باشتر شەڕەکە ببینێت. دەنووسیّ" ژنان بۆ هاندانی گەنجە کوڕان لەوشەڕەدا هەلهەلەیان دەکلێشا و دنەیان دەدان، لە درێژەدا دەڵیّ:

"لەئێوارەدا وەجاغ زادەکاتن ئالای شازادە ئەحمەد بەدەستەوە کەوتنە نێوان و ئاوری شەڕ کوژایەوە و بڵاوەیانکرد و هەرکەس کوژراوی خۆی بردەوە و بە دابونەریتی خۆیان

ناشتیانن. بۆ دوا ڕۆژدا ڕدێن سپی و کەیخوای بە هاروەندان چەند سەر ماین بە نیشانەی خوێن بەست درا بە پاش ماوەی عەشیرەتی لایەنگرانی ئێمە. هەرئەو کاتی بەهاروەندان بە تووڕەییەوە دەیان گوت" ئەگەر ئەو فەرنگیە لامەزەبە بەتەما بێت بچێتە خوڕەماوا دەبێ مەبلەغێك حەقی دەرچوون بە ڕێگەدا بدات... بەڵان ئەوکەسانەی سوێندیان بۆ خواردبووم ڕازی نەبوون و" خۆیان بۆ ئەو تاواتە (غەرامەیە) شل نەکرد. ئەوانیش گەلێك جنێو و قسەی نامەربووتیان بە فەرەنگی بێ ڕەوشت گوت کە بۆتە هۆی ئەو کوشت و کوشتارە، ڕۆیشتن بە شوێن کاری خۆیاندا."

ئەمرا" ویلسین دەنووسێ ئەو دوو تایەفەیە ژن و ژن خوازیان کرد و کچیان لە بەر خوێندا و بەڵێن دەدەن لەژێر چاودێری بەهاروەندان بە کەیفی خۆی لە ناوچەکەدا بێت و بچێ و خەریکی پلان دانان و نەخسەکێشانی خۆی بێت، ٢٠ لیرە یان خەسارەت بداتێ. ویلسین لە نێزیك خوڕەماوا کەسێك بە ناوی میرزا عەلی ئەکبەر "ئاگنت" یان نوێنەری دەوڵەتی ئینگلیز دێتە پێشوازی. خانە خوێ پێی دەڵێ دیوان بێگی فەرمانڕەوای ئەو شارە لە دوومیلی خوڕەماوا لەسەر ڕێگە چاوەڕێیەتی. ویلسین لەو شارەنامەیەك بۆ دایك و بابی خۆی دەنووسێ و بەم چەشنە باسی ناوچەکە دەکات:

"خوڕەماوا وێرانەیە و پڕە لە پشێونی و کەس بەکەسە...بەڵایەکی ماڵ وێرانکەرە بۆئەو خەڵکە ڕەش و ڕووتە کە بەدەست دەسەڵاتدارانەوە خوراون... ئەگەر کارێکیان بۆنەکرێت خەڵکی ئەم وڵاتە ڕۆخساری خۆشی نابینن. لەو بارودۆخەدا جێی دڵخۆشییە کەوا من بە پێی پەروەردەی خۆم ئەرکی سەرشانم بەرێوە دەبەم. سەردانی ئەو شوێنانەم کردووە پێشتر لە لایەن ناوەندی ئیدارەی سوپاوە نەخشەیان بۆ سازکرابوو" بەڵام هەو نەبوو، لەسەررا نەخشەم بۆ داناون."

ئارنۆڵد ویلسین دوای ماوەیك بۆ ئەوەی لە نێزیکەوە چاوی بە نەزەر عەلی خان بکەوێ" دەچێتە تەرحان و مەڵبەندی کەشکان. لەنێو ڕێدا دەکەوێتە بەر پەلاماری چگنییەکان و هەروەك خۆی دەڵێ لەگەڵ هاوڕێکانی لێدانێکی باشیان وێ دەکەوێ. بێ ئەوەی جێیەکی بشکێنن تەواو خوری-شۆری دەکەن. یەکێك خەریك دەبێ سەری ببڕێت، کوێخای گەڕەك فریای دەکەوێ و ڕزگاری دەکات. ویلسین لە درێژەدا دەنووسێ:

“کوێخا مژێکی باشی لە قەننەکەی دا و گوتی“ بە تۆڵەی ئەو سووکایەتیەی پێیان کردی مانگێك خزمەتت ئەکەم“ ئەگەر ببی بە موسڵمان کچێکت لێ مارە دەکەم“ وەك ئەستێرەی گەلاوێژ، مانی نەتوانێ وێنەی لە وێنە بکێشێت. بە بیستنی ئەو گفتە نەك هەر ئەوانەی لەوێ بوون، خۆیشی قاقا بەم درۆیە پێکەنی.”

ئەمجار، کوێخا پێی دەڵێ شتێکم بە دیاری پێ بدەی. ئەویش چوار قەبزە تفەنگ، دووهێستر، سەد تمەن پووڵی نەخت، دوو کاتژمێر و دووبینێك. ویلسین نووسیویەتی“ دوای دمەتەقەیەکی زۆر توانیویەتی دەمانچەیەکی بداتێ کە پێشتر کوێخا بە ەی خۆی دەزانی، تفەنگێك و پەنجا تمەنی دەنێتە سەر ئەوسا لە چنگی چنگیان نجاتی دەبێت. ویلسین پەنجا تمەن پووڵ بۆ دۆستێك لە نەهاوەند دەنووسێ و دەڵێ ئەو پارەیە بۆ ئەوەیە کوێخای چنگی بە گەرموگوڕی پێشوازیی لێکردوون و ئەوانی مەنەتباری خۆی کردووە.

ئارنۆڵدویلسین وەختێ دەگاتە تەرحان سەرەتا باسی تایبەت مەندیەکانی نەزەر عەلی خان ناسراو بە فەتحسولتان دەکات. بە هۆی پشێونی ناوخۆ مولکانە و ماڵیات ڕادەستی دەوڵەت ناکا، شەو و ڕۆژ کار و پیشەی بۆتە تریاك کێشان. لەگەڵ نەزەر عەلی خان سەبارەت بە قازانجەکانی نەوت و نەخشە و خەریتە وتووێژ دەکەن. توێژینەوە لەسەر کانیاوێك دەکات ئاو و نەوت ئاوێتە بوون. دەنووسێ دانیشتوانی ناوچەی کەشکان بە گشتی بە “باوەمەزن” و خەڵکی بەشی خۆر هەلاّتی کەشکان بە شازادە ئەحمەد سوێند دەخۆن. نەخۆش و دەردە داری خۆیان بۆ شفاوەرگرتن دەبەنە سەر ئەو دوو چاکە. ویلسین لە تەرحان دەگەڕێتەوە بۆ خوڕەماوا، دواتر دەچێتە بروجێرد و بەبێ ماتڵبوون دەگاتە هەمەدان و کرماشان و لەوێوە دەچێتە بەغدا، بەلاّم لەو مەودایەدا سەیروسەفەری خۆی نانووسێتەوە. لێرەوە کۆتایی بە یەکەم سەفەری خۆی لە ناوچەی لوڕستان دەهێنێت.

ئارنۆڵد ویلسین دوای دووساڵ واتە لە ساڵی ١٩١٣ ز. دا، بۆجارێکی دیکە وەك فەرمان بەرێك دەگەڕێتەوە بۆ لوڕستان. بە ڕێگەی تفلیس و باکۆدا دێتە تاران، ئەوجار لە هەمەدان و مەلایرەوە دەچێتە بروجێرد. لەو شارە دووسێ ڕۆژێك دەبێتە میوانی میرزا عەلی ئەکبەر “ئاگێنت” نوێنەری دەوڵەی ئینگلیز لە لوڕستان. لەوێڕا بە تەمای نەهاوەند دەکەوێتە ڕێ. لەنێو ڕێدا ئاگەدار دەکرێتەوە کە بیرانوەندەکاتن لەگەڵ هۆردوی ڕەوانەکراوی ژاندارمەریدا“ بە

فەرماندەیی ئەفسەرانی سوێدی تووشی شەڕ بوون. بەم هەواڵە زۆر تێك دەچێ" چونکە کاری نەخشەکێشانەکەی ڕادەگیرێت. هەر بۆیە دەنووسێ:

"ئاغاکانی بیرانوەند دەڵێن هەروەختێ ئینگلیزەکان لە خوڕەماوا و دەوروبەری خەریکی نەخشەکێشان بن، لە پێشدا کارێك بکەن بۆ ئەو کەسانەی بە دەستی هۆردووی دەوڵەت بەدیل گیراون."

ویلسین لە نەهاوەند ٤٠ سوار پارێزەری ڕەگەڵ دەکەوێ و، دەچێتە دەشتی خاوە و چاواری و لە خاوە سوارەکان بەڕێ دەکاتەوە. دوای ئەوان ٧٠ سواری نەزەر عەلی خان بە سەر کردایەتی کوڕە ١٥ ساڵەکەی بە ناوی سەردار ئەکرەم دێنە پێشوازی و بۆ دووەم جار دەچێتە تەرحان. گوتوویەتی" شاندەکەی ئێمە لەژێر چاودێری نەزەرعەلی خانی ٤٥ ساڵەدا تووشی گرفت نابێ. بەڵێننامەیەك لەگەڵ ئەو واژۆ دەکات تاکو لە کاتی نەخشە هەڵگرتنی هێڵی ئاسن دا پشت بە یارمەتیی ئەو ببەستێ. دوای چەند ڕۆژێك لەگەڵ ٣٠ سواری خانی تەرحان و تایەفە کانی نێو ڕێگەدا دەچێتە پۆل دوختەر (پردی کیژێ)، سەبارەت بە پۆل دوختەر بە باوەڕی ئەو ئاسەوارێکی مەزنی ساسانییە چیرۆکێك دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی" پێش ئەوەی پردەکە دروست بکرێت، دوو بەرە بابی لوڕ لەم بەر و ئەوبەری ئاوەکە ژیاون. کوڕە حەیران لەم بەرەوە دڵدۆڕاوی کیژی کوێخای ئەوبەری ئاو ئەودەبێت، بۆ ژانی دڵبەرەکەی جار و بارە بە زەحمەتێکی زۆر لە رووباری کەشکان پەڕیوەتەوە و چۆتە ئەوبەر. ئاخری ڕۆژێك ئاشقی سەوداسەر بازرگانێکی ساماندار بە دیل دەگرێ و زیندانی دەکاتن، پێی دەڵێ بەو مەرجەی لەسەر ئاوی کەشکان پردێك هەڵبەستێ ئازادی دەکات. بازرگان خەرجی سازکردنی پردەکە قبووڵ دەکات و خۆی نجاتی دەبێ و ئاشقە و ماشقە بەیەك دەگەن. دوای ئەو خزمایەتییە هەردوو تایەفەکە کوڕە دەکەنە کوێخا و دەمڕاستی خۆیان.

ویلسین لەسەر ڕێگەی پۆل دوتەر خوڕەماوا بۆ ئەوەی خۆی لە شەڕ و هەرای خان و بەگلەران بپارێزێت دیاری و پێشکێشیان دەداتێ، بەڵام بەو حاڵەشەوە خێڵی فەتحوڵڵایی پەلاماری ئەدەن، لەوێدا کوڕی کوێخای ئەو خێڵە فریای دەکەوێ و نەجاتی دەدات، ئاخری دەگاتە خوڕەماوا و لە ماڵی میرزا مەحمودی مستۆفی بارخانەی دەخات. لە درێژەدا دەنووسێ:

"حوسێن خانی بیرانوەند برای سالار مزەفەر دیدەنیی لێکردم... چاوەڕێ بوو دەمودەست لە کن میوانەکان خەڵاتێکی بدەمێ کە شایانی ئەوبێت. سەیرم کرد یەکێ

له سواره‌كانی له شه‌ڕ له‌گه‌ڵ ژاندارمه‌ری تفه‌نگێكی گرتووه و ئێسته زۆر شایی به خۆیه‌تی. حوسێن خان له‌به‌رئه‌وه‌ی له‌گه‌ڵ ئاغاواتی بیرانوه‌ند وه‌ك ئه‌وانی دیكه تێكه‌ڵ نه‌بووم زۆری پێ ناخۆش بوو. داوام لێكرد به خان و ئاغاواتی بیرانوه‌ند بڵێ بێن بیان بینم" به‌ڵام ئه‌و به چاكی نه‌زانی. ئاخری وام به باش زانی بۆ یه‌ك یه‌كی ئه‌واننامه بنووسم، پێم خۆش بوو له نێزیكه‌وه له‌گه‌ڵیان دانیشم. ده‌مانچه‌یه‌كی موزێڕم به‌دیاری دا به خۆی و ١٢٠ تمه‌ن پاره بیدا به‌براكه‌ی. بێجگه له‌وه‌ی ده‌بوو شێخ عه‌لی خان و غوه‌ڵامحوسێنی شوجاعوسه‌ڵته‌نه‌ی بیرانوه‌ندان رازی بكه‌م... سه‌رو نامه و ده‌مانچه‌كه‌م بۆ ناردن."

ویلسین ده‌ڵێ هۆزی لوڕان ئه‌م شه‌ڕه‌ی ئاخری له‌گه‌ڵ هێزی ژاندارمه به فه‌رمانده‌یی سوێدیه‌كان خه‌تاكه‌ی ئه‌خه‌نه ئه‌ستۆی ئینگلیزه‌كان. هه‌ر بۆیه ناچار ده‌بێت بۆ كاروباری نه‌خشه و پلان دانانه‌كه‌ی خۆی له سه‌رۆك عه‌شیره‌ته‌كان نێزیك بكاته‌وه. ده‌نووسێ: خه‌زعه‌ل له‌نێو هۆزی لوڕستان دا قسه‌ی ده‌ڕوات، هه‌ر ئه‌وه‌ی شێخ خه‌زعه‌ل ڕازی بووه به ڕاكێشانی هێڵی ئاسن، لوڕه‌كانیش ده‌نگ ناكه‌ن.

ده‌نووسێ له و هه‌ل و مه‌رجه‌دا هه‌وڵه‌كانی هێزی ژاندارمه بۆته هۆی ناكۆكی له نێوان خه‌ڵكی بروجێرد دا. له لایه‌ك ژاندارمه‌كان چه‌ك له خه‌ڵكی شاره‌كه ده‌ستێننه‌وه و له لایه‌كی دیكه‌وه نان و دۆیان ده‌بڕن. لوڕه‌كان ئه‌و هه‌له‌یان گرتۆته‌وه و" له‌مێژ نییه له‌سه‌ر ڕێگه‌ی مه‌لایر و سوڵتاناوا كاروانێكی مه‌زنیان ڕووت كردووه و" چه‌ند كه‌سێكیان كوشتووه.

وتووێژی ویلسین و تایه‌فه‌ی لوڕان به دانانی بارمته و مۆركردنی قورئان ئه‌نجامی باشی ده‌بێ و شانده‌كه ده‌به‌نه دزفول، به‌ڵام به‌بۆنه‌ی ناته‌بایی له‌نێو عه‌شیره‌ته‌كاندا گه‌ڕۆكه‌كان ناگات به‌و ئامانجه‌ی كه مه‌به‌ستی بوو. دوای ته‌واوبوونی ئه‌و ئه‌ركه‌ی له لایه‌ن وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌ی ئینگلیز تێكه‌ڵ به شاندی ناوبژیوانی كێشه‌كانی نێوان سنووری ئێران و عوسمانی ده‌بێت. له دزفوله‌وه ده‌چێته سه‌ر سنووری خۆرئاوای ئێران" تاكو به یارمه‌تیی مینورسكی سه‌رپه‌شتیاری شاندی رووسیه و نوێنه‌رانی ئێران و عوسمانی ده‌ستێكی هه‌بێ، له یه‌كلاكردنه‌وه‌ی كێشه‌ی نێوان ئه‌و دوو وڵاته‌دا. لێره‌وه ئه‌منییه‌تی ناوچه‌یی نه‌وتی ئێران مسۆگه‌ر ده‌بێت. ویلسین له كۆتایی یاداشته‌كانیدا ئاوا باسی ئه‌حواڵاتی خۆی ده‌كات:

"شه‌و ڕابوو به‌یان ئه‌نگوت و هه‌رماوم / باوه‌ڕم نه‌بوو تازه به‌ژیان هه‌ڵبێ دووچاوم"

* * *

دوایین سەیرانناممەیەك كە لە گەشتیارانی ئەڵمانی مابێتەوە و لێرەدا باسی بكەین سەفەرنامەی بلوشێرە. ویپرێت فن بلوشێر كاربەدەستی ئەڵمانی ساڵێك دوای دەست پێكردنی شەڕی یەكەمی جیهانی بۆ ڕێگری لە هاتنە پێشی هێزی رووسیە و ئینگلیز بەدژی ئاڵمان هاتۆتە ئێران و خەریكی جێبەجێكردنی ڕاسپاردە و" ئەركی سەر شانی بووە. كاتێك عوسمانی ئەندامی ئەڵمان دەرەقەتی ئینگلیز نەهات، بلوشێر ئێرانی بەجێ هێشت و گەڕایەوە. چەند ساڵ دواتر لە دەورەی دەسەڵاتی ڕەزا شادا وەك باڵوێزی ئاڵمان هاتەوە تاران. دووساڵ لەسەر كاری خۆی مایەوە و دیسان لە ئێران چووە دەرێ. هۆی ئەو ڕۆیشتنەی ئاوا دەنووسێ: "ڕەزاشا لەگەڵ من هیچ نێوانی خۆش نەبوو زۆریشم خراپە لێ دیتووە." بلوشێر بە گشتی دە ساڵ ئاگەداری ئاڵوگۆڕی بارودۆخی ئێران بووە و لە شەڕی یەكەمی جیهاندا، لەمەر سەدەڵاتی ڕەزاخانەوە چی دیوە نووسیویەتی:

"بە پێچەوانەی ئەوەی ڕەزاشا كارێكی كرد ئێران بەجێ بێڵم بەڵام سۆز و ئەویندارى من سەبارەت بە ئێران كەم نەبۆوە. لە دڵەوە هۆگریم بەو وڵاتە جوانە پەیدا كردووە بەم كەژ و بەندەنە سێحرایەی چاو و دەڵی هەر دڵدارێك دەڕفێنێت. دەرودۆڵ و ئاسەواری لە مێژینە و كەون و هەست بزوێنی مرۆڤ وا لێدەكات شاعیرانە لە پەسنی ڕابچێت. وڵاتێكە خەڵكی هێژا و هونەرمەند و جوامێری لە ئامێزدایە و خاوەنی فەرهەنگ و ئاسەوارێ دێرزەمانەیە."

بلوشێر سەردانی لوڕستانی نەكردووە" بەڵام تاك و تەرا ئاوڕێكی وێداوەتەوە. سەبارەت بە شەڕی یەكەمی جیهانی دوای ئەوەی هێزی رووسیە لە خۆرئاوای ئێران دێتە پێشێ و" هەمەدان خۆ بەدەسەدە دەدات. دەنووسێ:

"كێنت گراف كانیتس ئەندامی هێزی سەربازی باڵوێزخانەی ئاڵمان لە تاران لەگەڵ نیزامو سەڵتەنەی مافی خاوەن دەساڵاتی لوڕستان وتووێژ دەكات، تاكو شۆڕشەكەی لە كرماشان پەرە بستێنێ. لە نێوان ئەواندا پەیماننامەیەك واژۆ كرا تاكو چل هەزار چەكدار ئامادە بكەن. كانیتس بەڵێن پێدا بە كەیفی خۆیان چەك و چۆڵ و پارە و شاندێكی ئەڵمانی بۆ ئەوان تەرخان بكات. مانگانە بیست هەزار تمەن مەواجبیان بۆ دابین بكات و زەمانەتی دوو ملوێن تمەنی وەئەستۆ دەگرێت. كانیتس زۆرتر بەو هیوایە بوو سوارانی لوڕ كەوا شەڕكەری باشن، بە بۆنەی

نزاموسەڵتەنەوە پشتیان پێ ببەستێ، بەڵام نیزاموسەڵەتەنەی مافی تەنیا توانی چوار پێنج هەزار شەڕکەری لوڕ کۆبکاتەوە. زستانی ساڵی ١٩١٦ ز. کاتێك رووسەکان لە کەنگاوەر دەهاتنە پێشێ لوڕان دایان□گژانێ. لەو هەلەدا کانیتس لە بەرەی شەڕدابوو تاکو زۆرتر ببێتە هۆی ئازایی لوڕان، بەڵام بێفایدە بوو دەمەو خۆراوا لوڕەکان تەقەیان وەستاند و، دەستیان لە شەڕکردن هەڵگرت. کنیتس وەختی ئەم حاڵەی دیت خۆی خستە سەر پشتی کوێتەی تورکمانی و بۆی دەرچوو ئێستەش کەس نەیدیتەوە.

بلوشێر سەبارەت بە مەفرق و برۆنزەکانی لوڕستان بابەت گەلی تازەی بە دەستەوە داوە. لوڕێك لە گڵەجانێکدا شتێکی مەفرەقی دۆزیوەتەوە و، لە بازاڕی هەرسین بە شەکر گۆڕیویەوەتەوە، هەر ئەوە بووهۆی ئەوەی بزانن لوڕستان کەلوپەلی مەفرەقی لێ دۆزراوەتەوە. لەسەر زۆریەك لەو مەفرەقە برۆنزیانەی لەژێر گڵ و خۆڵ دەرکەوتوون ناوی پادشایانی بابلی بە خەتی بزماری هەڵکەندراوە. جگە لەوەش ناوی پادشاکانی بابلی دەرکەوتووە. مێژوویی ئەو مەفرەقانە دەگەڕێتەوە بۆ ١٢٠٠ تا ١٥٠٠ ساڵی بەر لەدایکبوونی مەسیح. کەوابێ ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دەسەڵاتی کاسییەکانی لوڕستان لە وڵاتی بابلدا.

سێر راجێر ئیستیونس، چەند لاپەڕە پێشتر بەجێمان هێشت مێژوویی ئەو مەفرەقانە زۆرتر دەباتەوە بۆ دواوە و باوەڕی وایە دەفرێك لە ناوچەی لوڕستان دەرکەوتووە کە بەدیاری بۆ پادشای کاسییان هێناوە، سەرەتای دەسەڵاتی ئەوان دەگێڕێتەوە بۆ ٢٦٢٤ ساڵ بە لەدایکبوونی عیسا.

بە باوەڕی بلوشێر کاسی گەل زۆرتر سەرقاڵی بەخێوکردنی ئەسپ بوون و بە خەڵکی بابلیان فرشتووە. زۆرینەی ئەو مەفرەقانەی دۆزراونەتەوە ئەم ڕاستیە دەسەلمێنێت. کەوابێ هیچ گومان لەوەدا نابینی کە ئەو مەفرەقانە تایبەت بە لوڕستان و دەورەی کاسی نەبێت. لەوساڵانەدا کە ئەومەفرەقانە لە خاکی لوڕستان دەبیننەوە دەگەنە بازاڕی هەرسین، ڕێکەوتێکی سەیر دێتە پێشێ، هەرئەوساڵە گونار ئەندرسێن لە باکووری چین چەند شتێك دەبینێتەوە زۆر شێوەیان لەو مەفرەقانەی لوڕستان چووە. لێرەوە ەزرڤانان باوەڕیان وایە کاسیەکان لەڕێگەی ئالۆوێری کەحێل و محەندەکاتن لەگەڵ چینییەکان مامەڵەیان هەبوویێت.

بەوتەی بلووشێر، بۆ ئەوەی کەس بە ڕازی لوڕەکان نەزانێ هەمیشە ئەم سنوورەیان پاراستووە نەکا کەسێکی بیانی کەسپەکەیان لەدەست دەربێنێ. ئەم مەفرەقانەی ئەمڕۆ لە

ناوچەی لوڕستان دۆزراونەتەوە لە ڕوویی مێژوویییەوە سات و سەودا و ڕادەی وشیاری ئەوان دەردەخات، بەڵام هەرئەو تێکەڵ نەبوونە وای کردووە لەم سەردەمەشدا ئاسەوارناسان نەتوانن ناوچەی لوڕەکان بکۆڵن و ڕازی چەند هەزارساڵەیان وەك خۆی بمێنێت.

* * *

خاتوو فریا ئیستارك گەشتیار و نووسەری ئینگلیزی بە قەولی مورتنسنی ئەڵمانی و نووسەری کتێبی ڕەوندانی لوڕستان دەکەوێتە نێو ڕیزی ئەو خاتوونە بوێرانەی، شێرانە سەردانی ناوچە دوورەکانیان کردووە و نەیان هێشتووە ئاوات و حەزیان زیندەبەگۆڕ بێت. ئیستارك لە ساڵی ١٨٩٣ ز.دا لە ئینگلستان لەدایك بووە و، خوێندنی لە فێرگەی لێکۆڵینەوەی شەرقی لە لەندەن تەواو کردووە. دوو جار سەردانی وڵاتی ئێران دەکات، یەکەم جار لە ساڵی ١٣٠٦ هەتاویدا لە سەرەتای فەرمانڕەوایی ڕەزاشادا، دواجاریش ساڵی ١٣١٠ هەتاوی. بە هۆی ئەوەی دەسەڵاتی باشی لە زمانی فارسی و عارەبیدا هەبووە لە سەیروسەفەراندا خەڵك خۆشیان ویستووە و" حورمەتیا گرتووە. ئەو گەشتیارە زۆر ژیرانە توانیویەتی ئاڵ و گۆڕی دەورەی قاجاریە بگوێزێتەوە بۆ سەر دەسەڵاتی پەهلەوی و بارو دۆخەکە شی بکاتەوە. سەفەرنامەی الموت، لوڕستان و ئیلام دەنووسێ و" کاتی خۆی عەلی محەمەدی ساکی کردی بە فارسی.

هەروەك گەڕۆکان باسیان کردووە و" خۆیشی دانی پێداناوە سەفەرەکەی زۆرتر بۆ ناوچەی لوڕستان بەهۆی ئەو مەفرەقانەوە بووە کەوا ناوبانگی بیستوون، هەر لەو سەردەمانەدا دەبێ ناوبانگی مەفرەقی لوڕستان کەوشەنان دەبڕێ و دەگاتە جەرگەی ئەورووپا و سەرنجی تاسەباران دەڕفێنێت. سەفەری ئیستارك دەکەوێتە سەروبەندی یەکجێ نشینی عەشیرەتەکان، بەڵام بە تەواوی چەتەیی و ڕێگری کۆتایی نەهاتبوو. باج وەرگرتن و ڕووتکردنی کاروانی چەند ساڵێش دوای شەڕی دووەمی جیهانی هەروا بەردام بوو. من خۆم لە بیرم دێت دەستەی ڕێگر و جەردە لە ملەی "گەچ وەنی" خەریکە شاری خوڕەماوا دای دەپۆشێت شەوانە بە چەکەوە ڕێیان لە ڕێبواران دەبەست. تووشی هەرکەسێك دەهاتن قڕانێکیان باج لێ دەسەند. پۆلیس و کارگێڕانی دەوڵەتی لەبەر دەروازەکانی خوڕەماوا ئەوشوێنانەی بە باجگیران بەناوبانگ بوو، تاکو لەم ساڵانەی دوایەدا بە ناوی حکوومەتەوە باجیان لەو ڕەوەندانە دەسەند کە دانەوێڵەیان بە سواری

یەکسم دەهێنایە شار. ئەوانیش بەهۆی ئەوەی لەو کاتەدا حەشیای خودایان لە باخەڵدا نەبووە، ناچار دەبوون هەتا دەگەڕێنەوە کڵاو یان پەستەك و عابای بەرەیان وەك بارمتە دادەنێن.

خاتوو ئیستارك پێش شەڕی دووەمی جیهانی لە ڕێگەی نەهاوەندەوە دێتە خاوە، حەزدەکات چاوی بە دەسەڵاتداری ئەلەشتەر بکەوێت. دەنووسیٚ" گەشتیارێکی بیانی ناتوانیٚ بچێتە باکووری لورستان مەگەر ئەوەی لوڕەکان پشتیوانی لیٚ بکەن. سەرەتا دەچێتە لای لوڕانی کەرەم عەلی لە نێزیك نووراوای ئێستە. کوێخا لەماڵ نابیٚ و کوێخاژن زۆری ڕێز دەگریٚ. تاریفاتی خاتوو فریا ئیستارك لەو ژنە بەڵگە و نیشانەی سەرەژنی و دلۆڤانی ئافرەتی لوڕ دەردەخات، ئەگەرچی وەك کوێخاژنێك ناوی دێنێت، بەڵام با بزانین لە درێژەدا چی دەنووسیٚ:

"شۆخەژنێکی بە تەواومانا خاتوون بوو، چاو جوان و ئەبرۆسەقەر، جوان وەك خەزاڵەشۆڕی مەلانەبی و خاتوو حەبیبەی حەزرەتی ناڵی، بزەی سەر لێوی مەراقی سەد ساڵەی دڵ و دەروونی تۆرەمەی باوە ئادەمی ڕادەماڵی. پرچ و پەلکەی لە چەشنی ڕەشماری دەیان دیوانە شیعری بە هۆزانڤانان دەهۆنییەوە. دەسماڵی سەری لە شێوەی نازدارانی کەج کولا سەیوانی سیلەی چاوی کەژاڵی بوو....باڵاپۆشێکی تاوبردوویی دەبەر دابوو ناوقەدی بە سڵسڵە و پلپلە ڕازابۆوە...جوانییەکی بە ماڵەکەی بەخشیبوو کە بە عالەمی ئاشکرا ڕێبواری ماندوویی دەحەساندەوە، بە کەیفی خۆی جلەکانمی پشکنی و بە گەرمی دەئامێزی گرتم و گوتی" تۆ خوشکی منی ئەمەش" منداڵەکەم بیخەسەر کۆشت."

ئیستارك لەوێوە بەرەو ئەلەشتەر دەکەوێتەڕیٚ. شەویٚ لە گوندێکی نێزیك پاسگای ژاندارمەری دەمێنێتەوە. لەو کاتەدا باسی فەرمانی دەسەڵات دەکەن" کە ماوەی پێنج ڕۆژیان مۆڵەت داناوە لوڕەکان جلوبەرگی خۆیان بگۆڕن، (دیارە هەر ئەو کاتی فەرمانی ڕەزا خان سەرتاسەری ئێران دەگرێتەوە و کوردەکاتنیش لەم فەرمانە بیٚ بەش نابن و بە زۆرداری کڵاوی پەهلەوی دەنێنە سەریان.) بۆ دوا ڕۆژدا بەرلەوەی بگاتە ئەلەشتەر سەرەتا سەبارەت بە بارو دۆخی ناوچەکە بۆ خوێنەرانی چەند پەیڤێك یاداشت دەکات. دەنووسیٚ ئێرە شوێنی فەرمانڕەوای باکووری لوڕستانە و تاکو سیٚ ساڵ پێش ئێستە چەتە و تاڵانچیان گونی گوندایان دەردەهێنا. مێرعەلی خان لەو قەڵای ئەلەشتەرەدا

فەرمانڕەوایی کردووە. لەبەرئەوەی دەسەڵاتی پاشا بەسەر ناوچەکەدا زاڵبووە و هەمیشە ۲۰۰۰۰ چەکداری بەدەستەوە بووە، بەردەوام هەڕەشەی لە خوڕەماوا و نەهاوەند کردووە. هەمووڕۆژێ سێسەد کەس لەسەر خوانی ئەو نانیان خواردووە، سەرئەنجام دەوڵەت هەوڵی لە نێوچوونی دەدات. لێرەوە سەرهەنگ گریخان یان گیگوی ئەرمەنی و فەرماندەی سەربازی لوڕساتن لە ڕواڵەتدا دینە یارمەتیی مێەرعەلی خان بۆ ئەوەی خانی ئەلەشتەر بتوانێ ئەم دژمنەی بە چۆکدا بێنێ، بەڵام سەرهەنگی ئەرمەنی لە نیوەی ڕێگەدا مێەرعەلی خان دەست بەسەر دەکات و ڕادەستی خوڕەماوای دەکات و لەوێندەرێ بەبێ یەك و دوو لێکردن لە داری ئەدەن. گیگۆ بەناوی شای مەملەکەتەوە دەست بەسەر دارونەداری خانی لە دار دراودا دەگرێ و عەشیرەتی ئەلەشتەر و خاوە چەك دادەنێن و قەڵا بێخان دەمێنێت.

ئیستارك دوای ئەو بەرکوڵە، دەچێتە لای کەریم خان برای مێەرعەلی خان ئەوسا لەلایەن دەوڵەتەوە دەسەڵاتداری ئەلەشتەر بووە. دەنووسێ بە فەرمانی ئەو دەسەڵاتدارە و کاربە دەستانی سەربازی قوتابخانەیەك لە ئەلەشتەر ساز بکەن و دوازدە منداڵ وانەی تێدا بخوێنن. لێرە دا باسی هاوژینەکانی کەریم خان دەکات و دەڵێ وتویانە ناوێیان نەبێ هەمووشتیان خاچ پەرستیە.

ئەمجار خاتوو ئیستارك دوای چەند ڕۆژ حەسانەوە لە ئەلەشتەر لەگەڵ سەرۆکی ژاندارمەری ئەوێ بەناوی نایب سەردارخان بۆ دیتنەوەی ئەنتیکەجات و ئاسەواری کۆن لەنێو گۆڕە کۆنەکاندا ڕێگەی دلفان دەگرنەبەر. دەڵێ سەردانی ئەو ناوچانە لەگەڵ پلەبەرزێکی ژاندارمەری وەك ئەوە وایە شووڵ بکەی بە کونی هەنگە ژاڵەدا. بە دیتنی ئێمە تەواوی خەڵکەکە ئاڵۆزابوون، لە گوندێك فەرمانبەرانی حکوومەتی تووکی سەری لوڕانیان کورت دەکردەوە ئەوانیش ئەمەیان بە سووکایەتی پێکردن دەزانی بەتەوسەوە دەیان گوت : "بەڕاستی ئەبەمە دەڵێن شارستانییەت" سەرۆکی ژاندارمەری باسی خێر و بەرەکەتی خاوەنشکۆی بۆ خەڵکەکە دەکرد و دەیگوت ئەگەر شای وڵاتمان فەرمان بدات خەڵك بە ڕووت و عۆریانی بگەڕێن، کەس ناتوانێ بڵێ لەل.

ئیستارك لەنێو ڕێی ئەلەشتەر و خاوەدا چاوی بە شەش برجی ژاندار مەری دەکەوێ لە هەر برجێکدا شەش چەکداری ژاندارمە ئاگەداری ناوچەکە دەکەن و هەر هەمووشیان

پڕ دەبن لە دیل و زیندانی. لە یەکێ لە بنکەکانی ژاندارمە دا ٢٠ زیندانی بە کۆت و بەند سندم کراون. لێرەدا بەرلەوەی درێژە بە سەفەرەکەی بدات سەبارەت بە ژیان گوزەرانی لوڕەکان دەنووسێ:

"سابوونیان نییە، بەڵاَن پێش نان خواردن و دوای نانخواردن دەست و چاویان بە ئاوی گەرم دەشۆن. زۆر کاتی وا هەیە نەخۆیان دەشۆرن نە سەر بە فەرزی خوادا ئەدەن. پوولْ و ماڵی خۆیان دەکەنە دەستی کەسانێکی ناوقەد سەوز، واتە سەیدەکاتن. لوڕەکان زۆر ڕێز لە میوان دەگرن و خاوەنی هەر مەزەبێك بێت کاریان بەکاری نییە. شتێکیش کەتەواو جێی سەرنجە ئەوەیە وەختێك ئەرمەنی و جوو دەچنە نێویان و کەلوپەلی کەونارایان لێدەکڕنەوە لە دەفر و ئامانی لوڕەکاندا نان و ئاو ناخۆن، بەڵاَم ئەوان ئەوەیان بە چاودا نادەنەوە و" بۆیان گرینگ نییە، بە لاَم وەختێ میوان لە خەودایە خەیالْ هەڵیان دەگرێت دزیی لێبکەن، دەڵێ خویەك بگری بە شیری تەرکی ناکەی بەپیری. لەچاوترووکانێکدا ئینسان ڕووت دەکەن" کەچی وەختێ لێیان میوان دەبی زۆر بە خولْك ماریفەتن."

لێرەدا ئیستارك دوای ئەوەی سەرۆکی ژاندارمەی ناوچەکە بەڕێ دەکاتەوە بۆ سەر ئەرك و فەرمانی خۆی، لەگەڵ چاوەدێرەکانی دەچێتە دۆڵی گچینە و گوندی ئەودالْ خان سەرۆکی هۆزی نورعالی، دەڵێ لەنێو ڕێدا ناتوی ئەو کاری پەساپۆرت دەکات. لە دۆڵی گچینە چاوی بە چەند گۆڕێکی هەڵتەکاو دەکەوێ مەفرەقەکانی دەورەی کاسیان بە تاڵاَن بردبوو. دوای ئەوەی چاوی بە ئەودالْخان دەکەوێ قەول دەدات هەرکەسێك لە گۆڕێکی کۆندا کەللەسەرێك بە ساخی وەبینێ سێ تمەن خەلاَتی دەداتێ. خەڵك لە خۆشی کەللەسەری سێ تمەن بایی لە ماڵ دێنە دەرێ و خێزەرە دەبەستن بۆ قەبر کۆڵێن" هەڵبەت ڕۆژێك دواترِ وەختێ ئیستارك چاوی بە کەللە سەران دەکەوێ دەڵێ ئەوەی من دەمەوێ ئەوە هەونییە! شەوێ لە تەنیشت تریاك کێشانی ئەبداتلْ خان دادەنیشێ و خەڵکەکەش مەفرەق دێنن بە ئیستارکی بفرۆشن، ئەگەرچی دەزانێ چەند دانەیان زڕە مەفرەقن بەڵاَم دەنگ ناکات و ئەوەی هێناویانە لێیان دەکڕێت. هەر لەو ناوچەیە چاوی بە زۆر کووپە دەکەوێ، کاتی خۆی مردوویان بە دانیشتنەوە تێدا ناشتووە.

خاتوو فریا ئیستارك دوای ڕۆژێك ماڵ ئاوایی لە ئەبداتلْ خان دەخوازێ و بەرەو مەڵبەندی چاواری وەڕێ دەکەوێت، لەوێدا دیسان تووشی سەردارخان سەرۆکی

ژاندارمەری ناوچەکە دەبێ و شەوێ لە برجی پاسگای ژاندارمە دەمێنێتەوە. لەوێ چاوی بە کەسێك دەکەوی لەسەر فیشەك دزین بە شەلّلاق لێی دەدەن. ئەو لە کەللەسەرێك دەگەڕێت کە بە ئەسپ و زین و لغاوەوە لە گۆڕ نرابێت، دەستی وێنەکەوتبێ و تێك نەدرابێت. لەوێوە خۆی دەگەیەنێتە نێو کاکاوەندان، بۆ ئەوەی بچێتە ئاوایی "سەرکەشتی" ناوەندی تایەفەی ئەیوەت وەند. کەسێك بەناوی کەرەم کاکاوەند دەبێتە ئەمیندار و چاوساغی زۆریش لە تاریفاتی ڕادەچێ دەیباتە سەرکەشتی و بە خێوەتی ئامانولاخانی دەسپێرێت. لەوێ دەژنەوێ کە تاکو ئێستە هیچ ئافرەتێکی بیانی نەهاتۆتە ئەو ناوچەیە و زۆریش شکیان بۆ ئەوە دەچێ ئەو ژنە خەریکی کاروباری سیخوڕی بێت، ئەمەش یاداشتی ئەو ڕۆژەیە:

"ژنێك نیوەشەو خەریك بوو دزیم لێ بکات، بە لام زوو وەخەبەر هاتم و دزە بۆی دەرچوو."

گەشتیارە ئینگلیزە کە بۆ بەیانی بێ ئەوەی سەردانی گۆڕخانان بکات و ئەنتیکەجات بستێنێ، بە ڕەقەی ڕێیەدا دەگەڕێتەوە بۆ نێو دلفینان. لەگەڵ کەرەم کاکاوەندی بەڵەدی دەچێ بۆ هەرسین. بە لام خالۆئەکرەم لە چوونە هەرسین خۆ دەبوێرێ و چیرۆکێکی بۆ دەگێڕێتەوە. کاتی خۆی کچێك لە هەرسین هەڵدەگرێ و تووشی شەڕ دەبێت. لەو شەڕەدا تەقە دەکات و کەسێکی بەدەست دەچێ، وەختێ دەگاتەوە ماڵێ دەوری دەگرن، لەسەربان تەقەیان لێدەکات و" کەسێك دەنێرێت کاکاوەندان بێن بە هاواریەوە، وەختێ دەزانن تریاکییە پەلە ناکەن تا شەو دادێت" دەڵێن شەو دەیگرین، بەلام شەوێ ژنە سەنگەر دەگرێ و" کەسێك لە هەرسینیان بریندار دەکات. لە کازیوەی بەیانیدا کاکاوەندان دەگەنێ و" هەرسینش ڕادەکەن و" ئەویش ڕزگاری دەبێت. ئێستەش ئەو هاوژینە دلۆڤانەی زۆر خۆش دەوێ.

خاتوو ئیستارك دوای ئەوەی دەگاتە هەرسین کەرەستەیەك دەست دەخات و" لەوێوە دەچێتە کرماشان و" بە ڕێگەی پشتکۆدا بەرەو بەغدا وەڕێ دەکەوێت، ئەمە یەکەم سەفەری ئەو گەشتیارەمان دەبێت.

سێ ساڵ هات و ڕابرد و هەمدیسان گەشتیارەکە گەڕایەوە وڵاتی ئێران و ئەم جارە بۆ سەیروسەفەرەکەی ناوچەی پشتکۆ هەڵدەبژێرێت. بۆ کۆڵینی قەبرەکۆنان لە

ئەشکەتەکانی کەبیرەکۆدا کوڕێکی لوڕ لە بەغدا نەخشەیەکی پێ دەدات، لەو دەورەیەدا ئیتر والی دەسەڵاتی لە پشتکۆدا نەمابوو. چونکی غوەڵامرەزاخان واتە دوایین والیی ئەوێ لەترسی لە داردان خۆی لە باوەشی بەغدا خزاندبوو.

خاتوو ئیستارك لە شاری بەغداوە دێتەوە پشتکۆ و دوایی چەند ڕۆژێك حەسانەوە دەچێتە مەڵبەندی مەلەکشایی، دەڵێ خەڵکەکەی قاپووت و کەپەنك دەبەر دەکەن و مێزەر و تەپلە یان لەسەر دایە و هەمووخەنجەر دەبەر پشتێن و سەر و پرچیان درێژە. وادیارە فەرمانی ڕەزاشا هێشتا لەو ناوچەیە دا جێنەکەوتووە، تاکو سەر و ڕدێنیان کورت بکەنەوە و جلوبەرگی کەونارای باب و باپیریان لەبەر دارنن. مەڵبەندی مەلەکشایی بەجێ دەهێڵێ و دەچێتە گوندی "ئەرکەوازی". لەوسەفەرەدا دەڵێ وەختێ لەسەر کانی سێ ئافرەتی جەحێڵ دەبینێت ئەوان دەزانن ڕێبوارن داوایان لێدەکەن بێنە ڕەشماڵەکانیان و میوانیان بن. ئاوا دەنووسێ:

"خەڵکی ئەرکەوازی لەوپەڕی هەژاریدا دەژین، گۆشتی حەیوان و پەلەوەر و هێلکە و شیر و برنج و قەند و چایان نییە، ئەوەی ئێمە دیتمان فەردەیەك ئارد و چەند دەنك تەماتە و هاروێ بوو، بەڵام وەختێ میوان ڕووی تێکردن سەرەڕای ئەوەی نانیان جۆیینە خوڵکیان گەنمینە. هەرئەوەی هەیانە دەینێنە سەر سینییەك و، لەپێش میوانی دادەنێن."

ئیستارك لەسەر کانییەوە لەگەڵ ئافرەتەکان دەچێتەوە و دەبێتە میوانیان، ئاوا لە پەسنی ژنی خانەخوێ ڕادەچێت تابلێی دلۆڤان و زمان خۆش و خۆش سیما بوو. دەڵێ ئافرەتەکان یەکیان بووك و ئەویدی کچی و یەکیشیان خزمی ئەوان دەبێت. هەروەك خۆی باس دەکات دوای ڕۆیشتن لە تەنیشت کوانویی خاوەن ماڵ دادەنیشێ و ئەم چەند دێرەی خوارەوە دەنووسێ:

"لە جوانی ئەو دوو کیژە نازدارە لوڕەدا توابوومەوە، لام وایە ئەگەر هەناسەی مەسیحایی ئەوان مردوویی سەر تاتە شۆری بگرتایە ڕۆحی وەبەر دەنا، دەست و پەنجەی ناسك و لەتیفیان، ڕووخساری وەك ئەستێرەی ڕۆژێ، تاسکڵاو و شەدە و گێلگێلەی سەریان، پەپوولە شەرمی دەکرد لەسەر گۆنای لە چەشنی گوڵیان بنیشێتەوە. شەڕواڵی ڕەنگین و پاوانە لەپێ بوون، دەرە لینگی چێندراوی شەرواڵان کەوتووە سەر گوێزنگی پێ ڕووتەکانیان...بێجگە لە خاڵی سروشتی خاڵی فیروزەیان لە لای لێو کوتابوو... لە کاتی

هەویرشێلاندا بۆنانی شەوێ هەر خۆش بوو سەیری خۆت بدەیە زەند و قۆڵی جوانی ئەمناسکە کچانە، پاوانەی زێوینی ئەستووری پێیان لەبەر تیشکی ئاگری تەندوورەکە دەدرەوشایەوە و ریشەی دەهات."

دیسان دەنووسێ:

"وەختێ تەماتەیان بۆ کولاَندین لەبەرئەوەی خواردنەکە کەم بوو خوانەکەیان بۆئێمەی سێ کەسە میوانەکە دانا. کورێژگە وەختێ چاوی بە نان و خواردنەکە کەوت ئەسرینەکانی دابارین، دایکی لە ڕوویی ئێمە بەخۆی داشکایەوە و، بە ئارامی زللەیەکی خێواندە بناگوێی کورێژگە و بەهۆی ئەوەی دەستی بۆنی تەماتەی لێدەهات سەرپەنجەی نایە دەمی کوڕەکەوە. بە نیوە تێری دەستم لە خواردن کێشایەوە و، ئەوەی مابوو لەبەر دەمی چوار منداڵی خانەخوێ دامنا تاکو ئەوان بیخۆن، کچۆڵەکەیان وەختێ زانی هیچی بەر ناکەوێ لەولاوە کروشمەی کرد."

دیسان ئیستارك لێرەدا باسی حورمەت و میوان گری لوڕان دەکاتن و دەنووسێ:

"یاساو قانوونیان وایە ئەوکەسەی لە ماڵ و ڕەشماڵیان نێزیك دەبێتەوە هەتا نەچۆتە ژووری" وەك نەیار و دژمن سەیری دەکەن" بەڵام وەختێ غەریبە پێی نایە ڕەشماڵەکەوە" بێجگە لەوهێ سەری دەپارێزن بە چاوی میوان تەماشایی دەکەن، ئیتر نەك هەرئەومالَە بەڵکە لەنێو هۆزەکەشدا حورمەتی دەگرن. لوڕەکان سەرەتا کەسێك دەبینن لێی دڕدۆنگن، بەڵام وەختێ میوان خۆی ناساند" زۆری قەدر و حورمەت دەگرن."

فریا ئیستارك دوای ئەوەی مالاَوایی لە گوندی ئەرکەوازیان دەکات لەنێو ڕێگەدا شەوێك میوانی ئاشەوانێك دەبێت و لە ڕەشمالاَنی تایەفەی "دوسان" وەچان دەگرێ و سەردانی قەلاَیی شەداد دەکاتن کە ئەویش ئاسەواری دەورەی ساسانییە لە دۆڵی کافران، سێ ڕۆژ لە ئاوایی تایەفەی "مووسا" میوان دەبێت، بۆ ئەوەی لە دەوروبەری ئەم ئاواییە لەگڵەجانان ئەنتیکە جاتی دەست بکەوێت. کاتێك دەیهەوێ لە چۆمەکە بچێتە ئەوبەر پیاوێك لە کۆڵی دەکات و دەیپەڕێنێتەوە، خاتوو ئیستارك گوتوویەتی" ئەم کۆڵسواریەم پێخۆش نەبوو! لەوبەرەوە سەردانی ڕەشمالاَنی تایەفە گەلی لارتی و هەندمینی دەکات و شەوێ لە گوندەکە دەمێنێتەوە هەروەك دەڵێ جێ خەوەکەی لە ەوتێلەکانی شیکاگۆ ئەمینتر بووە. باوەڕی وا بووە ئەم دوو تایەفەیە کۆنترین خێڵێکن لە ناوچەی پشتکۆدا تا

ئێستە هەرماون، دەڵێ ئەوانە پاشماوەی بتپەرستانی سەدەکاتنی رابردوون و ڕۆژگارێك پشتکۆ سەرلەبەر موڵکی ئەوان بووە. لە گوندی لارتی هەرکەسە و ماڵی خۆی بەدەوری داربەڕوویەکدا سازکردووە، سەر و پژی دارەکە بۆتە سەرباری ئەوماڵە، ناوقەدی درەختەکە لە ژوورەوە گەنجینە و کولێنە بۆ کەلوپەل ڕاگرتن. دیواری ماڵەکانیش لە چیخ دروست کراوە. چەند قرانێك دەدات کەونە گڵکۆیان دەدەنەوە" بەڵام هیچی دەست ناکەوێ. لە گوندی هەندمینی دوای ئەوەی چەند قەبرێك هەڵدەگێڕێتەوە ئارەزووەکەی وەدی دێت و" کەللەسەرێکی دەست-لێ نەدراوی دەست دەکەوێ کە مێژووەکەی زۆر کۆن دەبێت. لەگەڵ خۆی دەیبات بۆ مۆزەخانەی عێراق.

لە گەڕانەوەدا لە گوندی هەندمینی شەوێ لە ماڵی پیرە مێردێك دەمێنێتەوە" پێشتر بۆ دانەوەی گۆڕخانان سێ قرانی پارە پێ دابوو. دەڵێ ئەو پێیرە مێردە ئاورت تێبەردایە بۆسۆی لێ نەدەهات، ژنێکی جەحێڵی مارە کردبۆوەوە و کچە بێ بابەکەی ئەویشی بەخێو دەکرد. وەختێ دەگەڕێتەوە گوندی تایەفەی مووسایی و هەوڵ دەدات هەر چۆنێك بێت بە دزیەوە سەردانی ئەو ئەشکەوتە بکات" ئەنتیکە و گۆڕخانەی کۆنە مردووانە. ئای بگرە ئەوەی لێی دەگەڕێ وەدەستی بکەوێت. بەهۆی ئەوەی ناوچەکە لەژێر چاوەدێری ژاندارمەریدا دەبێت وای دادەنێ دەچێت چاوی بە قەڵای دەورەی ئەنەوشیرەوان بکەوێت لە کێوەکانی ئەو مەڵبەندە. بەبێ ویستی ئەو لە ژاندارمەریەوە چەند کەس ڕەگەڵی دەکەون، ئیستارك هەوڵ دەدات لەنێو ڕێگەدا ئەوان ماندوو بکات، بە بیانوویی چاوپێکەوتنی کاولە کۆنەکان چەند کاتژمێرێك خۆیان لێ بدزێتەوە. پلانەکەی سەردەگرێت و خۆی دەگەیەنێ بە ئەشکەوت و مغارەکە. وتوویەتی بەهۆی پەلەپەل و بۆ ئەوەی هاوڕێکانی لێی زەنین نەبن نەیتوانیوە بەو ناو نیشانەی دەهەمبەر ئەشکەوتەکە پێنج درەخت هەیە بیبینێتەوە. ئەو هەوڵەی بە کۆتایی کارەکانی دادەنێت لە کۆڵینی گۆڕخاناندا.

فریا ئیستارك ماوەیك دوای ئەم پشکنینە لەگەڵ چاوساخەکەی دەست دەکات بە گەشت و گەڕان، دەڵێ ئەگەر ئەو پیاوە جووتێك پێڵاوی تازەی دەپێدابایە دەیتوانی دەوری گۆیی زەوی لێبدات، هەمیشە ژاندرامەکان چاوی جاسووسیان لەسەر هەڵنەگرتووە. وەختێ دەچێتە دێی سەروو حوسێناوا یان هەر ئیلامی ئێستە بەهۆی

ئەوەی ژاندارمەی لەگەڵ دەبێت کەس بە پیریەوە ناچێت. باسی دەوو کیژۆڵەی چاو جوان دەکات کراسی ئاودامێن و کۆتی مەخمەری سووریان لەبەردا بووە و لە نێودیٚ کەوتوونەتە شوێنی و داوایان لێکردووە هەڵوێستەیەك بگرێت تاکو ئەوان تێر تەماشایی بن. لە ناوچەی بەر ئافتوو باسی خانەخوێکەی دەکات کە دووکچۆڵەی بێبابی هێناوەتە لای خۆی، جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگی ئەو دوو کچەی زۆر پیٚ جوان بووە ڕازاوە مت و، موور و گوڵینگ و پلّپلّە. ئەو دوو کچە جوانەش جلوبەرگی زیپداری سەفەری ئەویان بەلاەوە جوان بووە. ئیستارك چەند دەرزیلەیەکیان دەداتیٚ بۆ ئەوەی ئەوانیش بیدەن لە یەخە و بەرۆکی کراوەیان.

بەوتەی ئیستارك لەو ساڵانەدا ناوی حوسێناوا دەگۆڕن و دەیکەنە ئیلام، دەنووسیٚ سیٚ ساڵ پێشتر لێرەوە چۆتە بەغدا لە ناوەندنی پشتکۆ چەند ڕەشماڵی دیتووە و یەك دوو خانوویەك کە تایبەت بوون بە والی لە ناوچەکەدا، بەڵام ئێستە دوای سەفەری ئەم جارەی کە سیٚ ساڵی پێچووە دەوڵەت شارۆچکەیەکی لیٚ سازکردووە و" چوار بلواری بۆڕاکێشاوە. ڕێگەوبانی لە ئیلامەوە گەیاندۆتەوە سەر شارەکانی دەوروبەر. دەڵیٚ شارەکە تەنیا ٢٠ دووکانی تێدایە.

وەختیٚ دەچێتە شاری ئیلام فەرمانبەرانی ناوخۆی لێی بە گومان دەبن و پێیان وایە سیخوڕی بۆ عێراق دەکات، یان خەریکی قاچاخی ئەنتیکە جاتە و لە وە دەترسن لە ناوچەی پشتکۆ ئاژاوە چیان بیکوژن و، نێوانی ئێران و ئینگلیز بشێوێت.

ئیستارك دوای ئەوەی خۆی بە بنکەی ژاندارمەری دەناسێنێت دەڵیٚ ئێستە لە ناوچەی پشتکۆ ترسی کوشتن و بڕین تەواو بووە هەمووکەس دەتوانێت بەبیٚ گرفت سەفەر بکات، بەڵام کەس ناوێریٚ لە عێراق پەل بیزێوێت. دوای ئەوە چاوی بە پارێزگار دەکەویٚ و لێی دەپرسێت خانمی ئیستارك لەگەڵ هاوڕێکانی لەو دەشت و کێوەی کەبیرەکۆ خەریکی چیە؟ گەشتیاری ئینگلیزی لێکۆڵینەوە لەسەر کۆنەقەبران دەکاتە ئامانجی کارەکانی و ڕوخسەد وەردەگرێت بەو مەبەستە بچێتە تەرحان و سەمیرە، بەڵام پارێزگار پێی دەڵیٚ دەبێت بچێتە تاران و لەوێنامە وەربگرێت. چەند دۆژێك لەو شارە دەمێنێتەوە لە تارانەوە هەواڵ دەنێرن بەرێز و حورمەتەوە ڕەوانەی بەغدای بکەنەوە.

خاتوو ئسیتارك لەگەڵ وەكیل باشی و سێ ژەندارمە دەچێتە مەندەلی. وەختی لەنێو ڕێدا دەگاتە توونێلە كە و وەكیل باشی پێی دەڵێ دەوڵەت مەجبوور دەبێت خەڵات بداتبە یەكەم شۆفێری كرماشانی بۆ ئەوەی بە ماشێنەوە بە تونێلە كەدا بچێتە دەرێ و شۆفێرەكانی دیكەش ئەو ترسەیان نەمێنێت.

لە "ئهیوان" شەوێ میوانی ڕەوەندان دەبن و لە ڕەشماڵی مەڕداران دەخەون. ئیستارك دەڵێ خەزێنەی خێلاتیات هەر ئەو ڕۆحە ئازادەی ئەوانە، ئەگەر ئەوەیان لێ بستێنن ئیتر هیچیان بۆ نامێنێتەوە. شارستانییەت وەختێ لێرە سەقامگیر دەبێت كە لەگەڵ ژیانی ئەوان مەودای زۆر نەبێت و حورمەت و نەریتیان نەڕووخێنێت. ئەو تەكووزیەی كۆمەڵگەی نیوە شارستانییەتی تاران بۆ ئەوانی بە دیاری دەهێنێت، لەگەڵ گیانی ئەوان سارگار نییە و بە لاڕێدا بردنە.

وەكیل باشی ژاندارم لەمەودای ئهیوان و سنووری عێراقدا باسی ئازایی خەڵكی لەك دەكات و دەڵێ وەختی خۆی لە دەورو بەری سەمیرە چوار ئافرەت هەبوون كە بە شێرەكچ ناو بانگیان دەركردووە، "قەدەم خێر" قیلاوەندی ژنێكی ئازاو چاونەترس و شۆخ بووە و نازی خاتوون بیرانوەندی و غەزی ئەلەشتەری خوشكی مێەرعەلی خان حەسەنوەند، دەڵێ گوتوویەتی" ئەوەی ئاخریان دوای ئەوەی تەڵاقی لە مێردەكەی وەرگرت، خۆی كوشت و چوارەم ئافرەت كاكۆلی خەڵكی كولیایی بووە لەبەرئەوەی پیاوی خۆی دەست نەكەوتووە تا ڕۆژی مردن هەر بە كچی ماوەتەوە.

خاتوو دیم فریا مادلین ئیستارك، دەگاتە سۆمار و شەو لەوێ دەمێنێتەوە و بۆ بەیانیدا بە وتەی خۆی لەگەڵ بیرەوەریی خۆش ڕێزی زۆر بۆ خەڵكی ئێران دادەنێ، كە توانیویانە هێمنایەتی لە وڵاتدا دامەزرێنن، لە سۆمار دەچێتە دەرێ و بەرەو مەندەلی لە بەغدا وەڕێ دەكەوێت.

* * *

بیرەوەریەكانی حاجی عەزلەمالیكی ئەردەڵان دەچێتە ڕیزی ئەو كەسانەی بە نوێترین كات لە دەورەی ڕەزاشادا ئەچنە دەڤەری لوڕستان و باسی سەفەری ڕەزاشا دەكات بۆ لوڕستان. ئەم سەفەرنامە نووسە بە ماوەی سێ ساڵ دەبێتە فەرمانڕەوای لوڕستان و لە

نێزیکەوە لەگەڵ خدە و ژیان و کولتووری عەشیرەتەکان ئاشنا دەبێت و بە هەموو کردار و ئاکارێکیان دەزانێت. جاری بەر لەوەی بچینە سەر وردەکاتریەکانی حاجی پێویستە سەرێك بکەین بە دووتوێی کتێبێکدا بەناوی سەفەرەکانی ڕەزاشا بۆ لوڕستان، لەو ماوەیەدا ڕەزاشا پێنج کەڕەت سەردانی لوڕستانی کردووە. یەکەم جار پلەی سوڵتانی هەبووە، لەگەڵ ئەبولفەتح میرزا کوڕی مزەفەرەدین شا ناسراو بە سالارودەولە. هەروەك دەزانین سالارودەولە لە دەورەی محەمەدعەلی شادا خولیای پادشایی بوو، دواتر هەوڵی دا تەختی ئەحمەدشا وەرگێڕێت. سالاردەولە بۆ ئەوەی لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێ بیری کردەوە کچی غوەڵامڕەزاخان، والیی پشتکۆ بخوازێت، بۆئەو مەبەستەش سەروان ڕەزاخانی سەوادکۆیی بە نێونەرایەتی خۆی بە شمشێرێکی نقێم بەندەوە دەنێرێتە خوازبێنی، بەڵام چیرۆکی ئەم زەماوەندەمان لەدەستدا نییە و هەرئەوەندە دەزانین سالاردەولە کچە لە والی دەستێنێت.

دووەم سەفەری ڕەزاشا بۆ لوڕستان لەژێر ناونیشانی سەرداری سپا و سەرۆکوەزیران تا زاخە، نێوان بروجێرد و خوڕەماوا، بەسەر دەکاتەوە. بۆ ئەوەی هێزێکی سەربازی بەم دەڤەرادارا ڕاکێشێت و بچێتە خوزستان کۆتایی بە دەسەڵاتی شێخ خەزعەل بێنێت، دیسان دەگەڕێتەوە تاران.

سێیەم جار بۆخۆشکردنی ڕێگەی خوزستان دێتە ناوچەکە، ڕەزاشا سەرەتا لە بروجێرد دابەزی و لە پرسەی سەر لەشکر ئەمیری تهەماسبی دا بەشداری کرد کە لە ملەی رازان بەدەستی لوڕەکان کوژرابوو. لە گوندی موحسێن لە نێزیك خوڕەماوا، بۆ کرانەوەی جادەی شوسە مەراسیمێکی سازکرد و" هەرئەو کارەشی بۆ تەواوبوونی تونێلەکە دووبارە کردەوە.

سەفەری چوارەمی لەساڵی ١٣١١ هەتاویدا دەست پێکردەوە، لەو کاتەدا حاجی عەزەلمومالیکی ئەردەڵانی دەسەڵاتی لوڕستان و بروجێرد و ئەلیگودەرزی بەدەستەوە دەبێت. جەنابی ئەردەڵان لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا بەو شێوەی خوارەوە باسی چوارەم سەفەری ڕەزاشا دەکات.

سەفەری پێنجەم لەساڵی ١٣١٥هەتاویدا دەکەوێتە دەورەی دەسەڵاتی دکتۆر حوسێنی مەرزبان لە لوڕستان. ئامانجی شا لەو سەفەرە بەسەرکردنەوەی تیپی سەربازیی

خوڕەماوا پشکنینی شوێنی شەڕی چەتەکانی لوڕ بوو لە چیای کەبیرە لەگەڵ سەربازانی ئەرتەشی شاهەنشایی کە بووە هۆی کوژرانی ٢٠ سەرباز.

ئێستەش دەچینە سەر باسی نووسراوەکانی حاجی عەزەلمەمالیك بزانین چۆن باسی دەسەڵاتی خۆی لە لوڕستان و چوارەم سەفەری شا دەکات. سەرەتا دەنووسێ بەر لەوەی بچێتە لوڕستان، دەسەڵاتداری ئیستراباد بووە، بە تەلەگرافێك ئاگەداری دەکەنەوە کە بۆتە فەرمانڕەوای لوڕستان و بروجێرد. دێتە تاران و دەچێتە لە لای تەیمورتاش وەزیری دەربار، لەوێ پێی دەڵێن" بە جێگای سەرتیپ پورزەند ئێستە تۆ دەسەڵاتداری لوڕستانی و بڕۆ بۆ ئەوهێ. ئەردەڵان دەنووسێ: جیاوازیەکە لەوەدایە ئیسترئاباد هیچی نییە و لوڕستان ترۆمیلی دەوڵەتی هەیە و" مانگانە سەد تمەن پارە وەر دەگرم. هەربەم ترۆمبێلە لەتارانەوە دێتە بروجێرد. لێرەوە مێر و مەلا و خان و قووڵەبەگان بۆ پیرۆزبایی گوتن سەردانی دەکەن و" زانیاریی زۆری لەمەڕ لوڕستان پێ ئەدەن. دوای ئەوە دەچێتە خوڕەماوا. سەرهەنگ ئیسماعیل خان فەرماندەی تیپ لە دلفان هۆردویی دامەزراندووە دێتە سەردانی فەرمانڕەوای تازە. ئەردەڵان دەنووسێ : بە یەکەوە ئاگەداریەکمان نووسی و داوامان کرد ئەگەر لوڕەکان ببنە هێزی پشتیوانی دەسەڵات ئەوا لە هەمووبەخششێکی دەوڵەت بەهرەمەند دەبن، ئەوسا نووسراوەکانمان بە فڕۆکە بەسەر دەڤەری لوڕستاندا بڵاو کردەوە. دوو ڕۆژ دواتر لەگەڵ سەرهەنگ باقرخان ناسراو بە بەمبی، هەرئەو کەسەی دوای کودەتا و دەستبەسەرداگیرانی تاران لەلایەن هێزی قەزاقەکانەوە، چووە لای ئەحمەد شا و لە مەبەستی قەزاقان ئاگەداری کردەوە و لە کاتێکی لەباردا سەرۆکی دارایی بۆ چاوپێکەوتنی سەرهەنگ سمایل خان بەرەو دلفان وەڕێ کەوت.

باقرخان سەرۆکی ژاندارمەری لوڕستان بە ئەردەڵان دەڵێ" ڕێگەی خوڕەماوا بۆ هەرسین تەواو ئەمینە و ترسی جەردە و تالانچی نەماوە، بنکەی ژاندارمەکان جۆرێك سازکراوەن" لەو مەودایەدا هەموویان یەکدی دەبینن.

ئەردەڵان لێرەدا باسی هێرشی لوڕەکان دەکات بۆ سەر ئەو دەستەیە و" دەنووسێ:

"کاتێك گەیشتینە گەروویی تەنگەڵانەکە، (ڕەنگە نووسەر مەبەرستی دۆڵی شیوەخۆ بووبێت) لوڕان تەقەیان لێکردین و" ترۆمبیلەکەمان پەنچەر بوو" لەچاو ترکانێکدا ٢٠ چەکدار دەوریان گرتین، ڕووتیان کردین و بە شاخیاندا هەڵگێڕاین. ماوەی حەوتەیەك لە ئەشکەوتەکاندا دیل و یەخسیری ئەوان بووین، خواردنمان بوو بە نانی وشك و ئاوی گرم.

ڕۆژێك سەرۆکی دارایی دەستی کرد بەگریان و پاڕانەوە بەڵێ من سەید و دکتۆرم، زۆر گریا و پاڕایەوە، لوڕەکان بەزەییان پێیدا هات و" لەگەڵ شۆفێرەکەدا ئازادیان کردن. دەیان زانی باقرخان پلەی سەرهەنگی هەیە و منیش وتم" دەسەڵاتداری لوڕستانم شا ئێمەی ناردووە خزمەتی ئێوە بکەین. ڕۆژێك یەکێ لە لوڕەکان لەگەڵ خۆی بردمی لەسەر تەمباسکێك ڕایگرتم، گوتی: تەماشا بکە ئەم دەشت و دۆڵەی دەیبینی ئەوە موڵکی ئێمە بوو، دەوڵەت داگیری کردووە و" ژن و منداڵی بەدیلی بردۆتە خۆراسان. بەڵێنم پێدا لەلای شا داوای بەخشین و قەرەبوویی بۆبکەمەوە...

دوای حەوتەیەك ئامۆژگاری کردن دڵی لوڕانی نەرم کرد و" سەرەتا سەرهەنگ باقرخانیان ئازاد کرد و منیشیان بردە لای یەکێ لە خانەکان، ئاغا لەگەڵ دەوڵەت نێوانی خۆش بوو. شەوێ میوانی ئەوبووم. بۆبەیانیدا چەند لوڕێك بردیانم بۆ زاخە و لەوێ بە سواری زرێپۆشی سەرهەنگ سمایل خان هاتمە خوڕەماوا، لەو ڕۆژە بەدواوە بەسواری زرێپۆش سەردانی ئەملاوئەوەلام دەکرد."

هەروەك لە نووسراوەکەیدا دەردەکەوێ دوای ماوەیەك سەرهەنگی پلە دوو ڕەزمارا دەبێتە فەرماندەی تیپ، دەڵێ بەوێنەی لوڕەکان چووست و چالاك بوو، وەختێ کێوبەکێو و شاخ بەشاخ دەکەوتە شوێن لوڕەکان، دەتگوت بەوری* بەیان و شێری ژیانە. زۆری پێناچێت دەبێتە سەرهەنگی پلە یەك. لە درێژەدا دەنووسێ لەبەرئەوەی ڕازاشا بەتەما بوو سەردانی خوڕەماوا بکات، عەمارەتی دەوڵەتی دەڕازێننەوە و لەگەڵ سەرهەنگ ڕەزمارا و سەرهەنگ حەسەنی ئاغاباشی فەرماندەی هێزی ژاندارمە بۆ پێشوازی کردن دەچنە ساڵحاوا. لەوێ ڕوخسەد لە شا وەردەگرێت تاکو بگەڕێتەوە خوڕەماوا بۆ ئەوەی خۆی بۆ پێشوازی کردن ئامادە بکات. حاجی عەزەلمومالیکی ئەردەلان دوای ئەم پێشبارە دەچێتە سەر چۆنییەتی هاتنی شا بۆ خوڕەماوا، ئەمەش پوختەی چیرۆك:

"پێشوازی چیانم فێر کرد چۆن ڕاوەستن و خاوەنشکۆ بەخێراتن بکەن، شا لە سەرپردی خوڕەماوا لە ترۆمبیل دابەزی، یەك بەیەك میر و مەزنی شارەکەم پێناساند... هەرئەو شەوە سەرۆکی ئیداراتی لوڕستان و بروجێرد کۆ بوونەوە و" هەرکەسە و لەسەر بارودۆخی ڕۆژ وتەی خۆی پێشکێش کرد. سەرۆکی دارایی لوڕستان و بروجێرد گوتی: ئەمڕۆ خاوەنشکۆ زۆریان حورمەت گرتین و" بە هیوام لەژێر سایەی والا حەزرهتدا وەحەسێین... من گوتم: سەرۆکی

دارایی فەرموودەیەکیان نەفەرموو."جوامێر" سەرۆکی دارایی گوتی ئێوە تێنەگەیشتن؟ شا ویستی لێم تووڕە بێت و جنێوم بداتێ، بەڵام شەرمی لە ڕدێنی سپیم کرد و پەشیمان بۆوە و فەرمایشتی نەفەرموو... بۆ بەیانیدا شا سەردانی سەربازخانەی فلك الافلاك دەکات، بۆ ئەوەی سەردانێکی سەربازی بوو من نەچووم. لە ماڵێ مامەوە دوای چارەکێك شۆفیرەکە بە ماشێنی فۆرد کە تایبەت بە ڕەزمارا بوو هاتە شوێنم گوتی: خاوەنشکۆ بانگی ئێوە دەکات. بەبێ ڕاوەستان خۆم گەیاندە قەڵا... لێی نێزیك بوومەوە و شا فەرمووی، ئەردەڵان لەبەرچیێ لوڕەکان بڕوایان بە دەوڵەت نییە؟ عەرزم کرد بەندەی نۆکەرت نەمبیستووە بێباوەڕ بن... عەرزم کرد هیچ کەس زات ناکا قسەی وای بەدەمدا بێت" بە ڵام ئەوەی راست بێت زۆر لوڕەکان ئازار ئەدەن و، هەروەختێ فەرماندەیەکی تازەتر دەسەڵاتی هۆردوو بەدەستەوە دەگرێت بە کەیفی خۆی لوڕان دەرەتێنێ و، پەتپەتێنیان پێ دەکەن و، دووریان دەخەنەوە و، لەسەر موڵکی خۆیان ناهێڵن" بۆیە ئەوانیش پەڕەوازەی کێو و چیاکان دەبن. فەرموویی کەوابێ چکەردەن؟ عەرزم کرد فەرمان بفەرموون کۆچ پێکردن و ڕاگواستن نەمێنێ و هەریەك لە تایەفەکان لە شوێنی خۆیان بمێننەوە و کەس موڵك و ماڵی خۆی بەجێ نەهێڵێت. لێژنەیەك ڕاسپێرە حەد و مەکانی ئەوان دیاری بکەن و بەناوی زەوی دەوڵەتەوە پشێونی سازنەکەن تا ئارامی باڵ وەسەر ناوچەکە بکێشێت. فەرمووی" هەر ئێستە بەبێ راوەستان بە تەیمورتاش بڵێ فەرمانەکە ڕابگەیەنێ و" لێژنەی تایبەت بگاتە لوڕستان..."

حاجی عەزەلموالیکی ئەردەڵان دوای گەڕانەوەی شا بۆتاران، دوای دەکەن تاکو بچێت و کاروباری لێژنەکە جێبەجێ بکات و" شاندێك بێنێتە لوڕستان و بە خێرایی ئەرکی خۆی ڕادەپەڕێنێت. ئەمجار ئاماژە بە خاڵێکی گرینگ دەکات کە جێی خۆیەتی لێرەدا پشت گوێی نەخەین:

"... بابەتێکی دیکە هاتە پێشێ... ئەویش دەستێوەردانی نوێنەرانی ملۆکی پەهلەوی بوو بەتەمابوون لە کرماشان و پشتکۆوە بێنە لوڕستان، هۆگری و موڵکی خاوەنشکۆ لە لوڕستان مسۆگەر بکەن... ڕەزمارا فەرماندەی تیپ تەگبیری بە من کرد و بەیەك گفت ڕاگەیاندنێکی نەینیمان دا بە دەفتەری تایبەت، کە بەباشی نازانین ئیدارەی موڵك و ماڵی پەهلەوی بێتە لوڕستان...ئەوانیش پەسندیان کرد و لوڕەکانیش دڵنیا بوون لەمەولا کەس دەستدرێژی ناکاتە سەر موڵك و ماڵی ئەوان..."

* * *

دوایین کتێب کە لەو سەیروسەفەرەماندا قسەی لەسەر دەکەین" (کۆچەرانی لوڕستان)نە، حەمەحوسێنی ئاریا کردوویە بە فارسی. ئەم پەڕتووکە وێنەدارە، سەفەرنامە نییە، بەڵام بەرهەمی چوار سەفەری تاکە کەسی و گشتیە بۆ ناوچەی لوڕستان.

دانمارکییەکان نێزیکەی سەد ساڵە لەسەر خێڵەسات و ڕەوەندەکاتنی ئاسیای خۆرئاوایی و خۆرهەڵاتی ناڤین و ئەفریقا خەریکی شیکاری و لێکۆڵینەوەن. لەوڕووەوە کۆمەڵێك ئاسەوار و کەلوپەلی ڕەوەند و عەشیرەتەکانیان لەم دەڤەرانە وەخڕ کردووە و" دوو مۆزەخانەی دانیمارکییان پێ ڕازاوەتر کردووە، بێ ئەوەی دەست بەرداربن ماندوو نەناسانە خەریکی دەوڵەمەندکردنی خەزێنەی خۆیانن، بەڵام بە ئاسەوار و کولتووری گەلان. هەروەك فەرەنسییەکان و دەوڵەتی ئینگلستان لە سەدەکاتنی ڕابردوودا بە کۆکردنەوەی ئەنتیکەجانی بەریناتمان لە مۆزەخانەی خۆیاندا توانییان وڵاتەکانیان بکەنە ناوەندی موتاڵا و توێژینەوەی ئاسەواری کەونارا و هەموو ساڵێك ملیۆن ملیۆن خەڵکی بە تاسە و ئارەزوو سەردان و دیدەنی ئەو گەنجینە گرانباییەکی مێژووی مرۆڤایەتی بکەن. شاراوە نییە کە سیاسەدی دانیماکیش هەرئەوە بێت و" وڵاتی خۆیان بکەنە ناوەندێکی توێژینەوەی ڕەوەندناسیی گەلانی هەمە جۆرەی دنیا. هەرچەندە وردە وردە خولی ڕۆژگار خەریکە وەك هەزاران کولتوور و پێشینەی لەمێژینە خێڵەسات و کۆچ و کۆچبار و گەرمێن و کوێستان دەکاتە بڵقی سەرئاو، گرینگی کەلوپەل و کەرەستەی هەوارچی و خێڵەکیان نرخ و بایەخێکی تازەتر لە مۆزەخانەی دانیمارك بەخۆیەوە دەگرێت.

کۆمپانی ڕێگەوبانی کامساکس ـــ ی دانیمارك لەو ساڵانەدا کە خەریکی دامەزراندنی هێڵی شەمەندەفەر و خیز ڕێژکردنی جادەی لوڕستان بوو، کۆمەکێکی زۆری کرد بە ەزرڤان و توێژەرانی کەوناراناس و کۆکەرەوانی کەلوپەلی بەردەستی دانیشتوانی ناوچەی باڵاگریوە و کۆدەشت و دەوروبەر.

فیلبگ کۆمەڵناسی دانیمارکی ساڵی ١٩٣٥ ز. ئەو کاتەی ڕێگە لە کۆچی ڕەوەندان گیرا هاتۆتە لوڕستان سەردانی باڵا گیرەوەی کردووە، گەلێك ئەنتیکەجات و نووسراوەی لەگەڵ خۆی بردەوە بۆ دانیمارك. نێزیکەی ٣٠ ساڵ دواتر ئەدلبرگ کۆمەڵناسی دانمارکی

بوو بەدرێژەدەری کارەکەی فیلبرگ و ئەویش کۆمەڵێك یاداشتی کۆ کردەوە. مورتنسنی دانمارکی بۆ جارێکی دیکە سەفەری کردەوە و" کارەکانی ئەوانی دەست پێکردەوە، بە کەڵك وەرگرتن لە تۆژینەوەکانی پێشووی کۆپەڕێکی بە ناوی کۆچنشینەکانی لوڕستان لەبەریەك نا و" لە ساڵی **١٩٩٣** ز. دا بە یارمەتیی ماڵی یەکێ لە بنیاتەکانی فەرهەنگی دانیمارك توانیی لە چاپی بدات. ئەو گەشتیارە لەو کتێبەدا دوایی کورتە باسێك لەسەر کون و کاژێی مێژووی لوڕستان و شێوەی کۆچی ڕەوەندان و کەلوپەل و پێداویستی ژیانی ڕۆژانەی عەشیرەتەکان، لێکۆڵینەوەی تەواو دەکات و" کۆمەڵێك ئەنتیکەجاتی بە نرخ دەباتە مۆزەخانەی دانیمارك و سەرنجی بینەران ڕادەکێشێت.